# ٢٠٠

# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئافرەتان



هەوێز حاجی علی

چوارەم چاپ
٢٠١٣






ناسنامەی

ناو: (200) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئافرەتان

بابەت: ئاینی

دانانی: حەوێز حاجی عەولی

چاپخانە: هێڤی

چاپ: چوارەم/2013

تیراژ: (1000 دانە

بەرهەم: (79)






لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٨٨)ی ساڵی (٢٠٠٦)ی پێدراوە.



07504671394

07504885903

hawler.chap@gmail.com

# ٢٠٠

# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

# بۆ ئافرەتان


ئامادەکردنی

حەویز حاجی عەلی



چوارەم چاپ

٢٠١٣

# پێشـــەکی

الحمد لله وكفى وصلى الله على النبـي المصطفى (ﷺ)..

ئایینی پیرۆزی ئیسلام رێزێکی تایبەتی بۆ ئافرەت داناوەو بەتەواوکـەرو پاڵپشتی پیاوانی دائەنێ، هەروەکو بێغەمبەری ئازیزمان دەفەرموویێت(ﷺ): (اِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ) رواه ابـو داود بـسند صـحيح واتـە: بەرسـاتی ئافرەتان پاڵپشتو هاوکاری پیاوانن.

جا ئەگەر بەوردی سەرنجی ئەو فەرموودەیە بدەین، بۆمـان روون دەبێتـە کەوا ئافرەت مافێکی ئیجگار زۆری بۆ مۆسگەر کـراوە، وەئـەو فـەرموودە پیرۆزە دەمکوتی هەموو ئەوکەسو لایەنانە دەکات کەبانگەشە بـۆ ئـازادی ئـافرەت دەکـەن، بـەڵام مەبەسـتیان شـکاندنو روخانـدنو کـاول کردنـی ئافرەتە،دەیانەوێ راپێچی یانەکانو مەلهاکانیان بکـەن بـەناوی ئازادییـەوە. هیچ بەرنامە یەکیان بۆ ئافرەتان پێ نییە جگە لەو قسە هەلـەقو بەلەقانـەی کەوەکو تووتی بەردەوام دەیلێنەوە کە دەڵێن:

١- فرە ژنی پێشێلّ کردنی مافی ئافرەتە بەڵام خۆیان هـیچ بەرنامـەیان بۆ قەیرەیی خوشکانمان دانەرشتووە.

٢- ئافرەت دەبێ ئازادی سێکسی هەبێت لەوەش مەبەستیان بێ رەوشت کردنی کۆمەڵگایە.

٣- یاخود دەڵێن ئافرەت چۆنی بوێ نابێ رێگەی لێ بگیرێ لەهەر شتێك کە دەیکات، بۆ هەموو ئەو رێکخراوانـە دەسـتێکی پـەنهان لەپـشتیانەوەیە

ئەیان سورێنی و بەرنامەی روخێنەریان بۆدا ئەنێ بۆ بنبرکردنی رەوشت لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا، کە هەرلەو رۆژەی کورد ئایینی پیرۆزی هەڵبژاردووە بەئاسودەیی ژیاوەو خزمەتی بەئایینی پیرۆزی ئیسلام کردووە.

**خوشکی خۆشەویستم:**

ئێوە لەئیسلامدا ریزی پێشەوەی کاروانی بانگەوازو شەهادەتتان گرتووە! یەکەم کەس باوەڕی هێنا بەپێغەمبەر (ص) (خەدیجە) بوو رەزای خوای لەسەر بێت، یەکەم شەهید (سومەییە)بوو ( رەزای خوای لەسەر بێت).

سەدان نمونەی ئازایی و بوێری لەلاپەڕەکانی مێژووی ئیسلامیدا ئافرەتان ئەکتەری بوون.

بەڵام لەسایەی بیردۆزە نەفامیەکاندا جگە لەئافرەتان بێ کشۆو شۆڕاوە لەبەهاجوانەکانی ناوکۆمەڵگا چی تر بەدی ناکرێت.. چونکە خۆ رووت کردنەوە.. ئیغراکردنی گەنجان.. لەش فرۆشی.. گۆرانی وسەما دروشمو بەرنامە ئامانجیانە.

لەکۆتاییدا داوا لەخوشکان دەکەم ئەم(۲۰۰) فەرمودەیە لەبەربکەن و بیکەن بەپەیڕەوی ژیانی خۆیان، خوشك و کچەکانیان ونافرەتانی تریش فێری حوکمەکانی تایبەت بەئافرەتان بکەن.

واخر دعوانا الحمد لله رب العالمين

**حەوێز حاجی علی**

۲۰۰٦/۳/۱٦



بسم الله الرحمن الرحيم

١) قال رسول الله ﷺ: ((إِنَّمَا نُهِيتُ عَنِ النَّوْحِ، عَنْ صَوْتَيْنِ أَحْمَقَيْنِ فَاجِرَيْنِ: صَوْتٌ عَنِ النَّغمة لَهْوٌ وَلَعْبٌ وَمَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ وَصَوْتٌ عِنْدَ الْمُصِيبَةِ، خَمشُ الْوُجُوهِ وَشَقُّ الْجُيُوبِ وَرَنَّةِ الشَّيْطَانِ)). رواه ابن سعيد والبزار وقال البغوي حديث حسن.

**واته:** بەڵێ ئێوەم قەدەغەکردووە لە دوو قیژەی بەد و ناهەموار: دەنگێك لەکاتی بوونی نیعمەت و خۆشیەکان کە بکرێتە بەزم و هەراو زورنالێدانی شەیتان، دەنگی دووەم لەکاتی ناستەنگ و دژواری کە بکرێتە قیژەو چرنوك لەخۆدان و یەخە دادڕین و زریکەی شەیتان.

٢) قال رسول الله ﷺ: ((تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)). رواه البخاري ومسلم

**واته:** ئافرەتان بۆ یەکێك لەم چوارە هەڵدەبژێررێن و دەخوازرێن! یان بۆ ماڵ و سەروەت، یان لە بەر رێزداری خانەوادەی، یان لەبەر جوانییەکەی، یان لەبەر ئاین پەروەریەکەی، جا ئافرەتی خاوەن ئاین بخوازە، تا بەخت یاوەرت بێت.

٣) قال رسول اللهﷺ: ((خَيْـرُكُمْ خَيْـرُكُمْ لأَهْلِـهِ، وَأَنَـا خَيْـرُكُمْ لأَهْلِي)). رواه ابن ماجة بسند صحيح.

**واته:** چاکترینتان باشترینتانن بـۆ خێزانـی، منـیش باشـترینتانم بـۆ خێزانم.

٤) قال رسول اللهﷺ: ((إِنَّمَا النِّسَاءُ شَـقَائِقُ الرِّجَـالِ)) رواه ابـوداود بسند صحيح.

**واته:** بەڕاستی ئافرەتان پاڵپشت و هاوکاری پیاوانن.

٥) قـال رسـول اللهﷺ: ((لاَ تَمْنَعُـوا إِمَـاءَ اللهِ مَـسَاجِدَ اللهِ، وإِذا استَأْذَنَتْ إِمْرَأَةَ أَحَدْكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فلا يَمْنَعْهَا))متفق عليه.

**واته:** ڕێگە لە ئافرەتـان مـەگرن کـە چـوون بـۆ مزگـەوت، ئەگـەر خێزانی یەکێتان مۆڵەتی چوونە مزگەوتی خواست بـا قەدەغـەی نەکات.

٦) قال رسول اللهﷺ : ((إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعْبِها الأَرْبَـعِ ثُـمَ اجْهَـد فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ)).رواه النسائي وهو صحيح.

**واته:** ئەگەر پیاوێك لـەنێوان چـوارپەلی ئـافرەتی خـۆی دانیـشت و لەگەڵیا جووت بوو، وە خۆی ماندوو کرد، ئیتر خۆشۆردن لەسـەر هەردووکیان پێویست دەبێ.

٧) قـال رسـول اللهﷺ: ((إِنَّ أَخْـوَفُ مَـا أَخـافُ عَلَـيْكُم اَلزِّنَـا وَالشَّهْوَةَ الْخَفِيَةُ))رواه الطبراني باسناد صحيح وقاله المنذري.

---

**واته**: ئەوەی من لێی دەترسم و ترسم لێی هەیە بۆ سەر ئێوە زینا و شەهوەت و ئارەزووە.

٨) قال رسول الله ﷺ: ((لاَ تَأْتُوا اَلنِّسَاءَ فِي إِسْتَاهِهِنَّ، فَإِنَّ الله لاَ يَسْتَحِي مِنَ الْحَقِ)) رواه أحمد والترمذي وحسنه.

**واته**: مەچوونە لای خێزانەکانتان لەدواوە، چونکە خوای گەورە شەرم لە حەق و ڕاستی ناکات.

٩) قال رسول الله ﷺ: ((اَلْحَيَاءُ وَالْعَيّ شُعْبَتَانِ مِنَ الإِيمَانِ، وَالْبَذَاءُ وَالْبَيَانُ شُعْبَتَانِ مِنَ النِفَاقِ)) رواه احمد وصححه الذهبي.

**واته**: شەرم و زمان پاکی دوو لقن لە باوەڕ، سوکی و قسەزلیش دوو لقن لە دووڕوویی.

١٠) قال رسول الله ﷺ: ((لأَنْ يَطْعَنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِمِخْيَطِ مِنْ حَدِيدِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمَسَ إِمْرَأَةً لـه تحلّ لـه))رواه الطبراني وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة.

**واته**: ئەگەر دەرزیەکی ئاسن لەسەر یەکێك لەئێوە بدرێت باشترە بۆی لەوەی کە دەست بدات لە دەستی ئافرەتێك کە ئەو ئافرەتە حەڵاڵ نەبێت بۆی.

١١) قال رسول الله ﷺ: ((ثَلاَثَةٌ لاَ تَرْفَعُ صَلاَتَهُمْ فَوْقَ رُؤُوسِهِمْ شِبْراً: رَجُلٌ أَمَّ قَوْماً وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، وَإِمْرَأَةٌ بَاتَتْ وَزَوُجُهَا عَلَيْهَا سَاخِطٌ وَالْعَبْدُ الإِبِقِ))رواه ابن ماجه باسناد صحيح.

---



**واتـه**: سێ کەس نوێـژیان بـستێك لەسـەر سـەریان بـەرز نابێتـەوە:
پیاوێك پێش نوێـژی بکـات بـۆ کۆمـەڵێك ئـەو کۆمەڵـە پێیـان ناخۆش بێت و حەز بە چارەی نەکەن، ئـەو ئافرەتـەی مێردەکـەی دڵگران و توڕە و بیزار بێ لێی، بەندەیەك لەدەسـتی خاوەنەکـەی ڕای کردبێ و هەڵهاتبێ.

١٢) قال رسول اللهﷺ: ((مَـنِ ابْتُلِـيَ بِـشَيءٍ مِـنَ الْبَنَـاتِ فَـصَبَر عَلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ)) رواه الترمذي بسند صحيح.

**واته:** کەسێك خوای گەورە تاقی بکاتەوە بە بەخشینی چەند کـچێك (واتە: چەند کچێکی پێ ببەخشێ و کوڕی نـەداتێ و یـان کـچی زیـاتر بـێ) ئـارام بگرێـت لەسـەریان و بـەخێویان بکـات و پەروەردەیان بکات، دەبن بە پەردە بۆی لـەنێوان ئـاگری دۆزەخ و خۆیدا.

١٣) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ يَنظُرُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَـنْ جَـرَّ إِزَارَهُ بَطَراً)) متفق عليه.

**واتـه**: خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا بەچـاوی ڕەحمـەت سـەیری کەسانێك ناکات کە لەبـەر لـووت بـەرزیان جـل و بـەرگیان تـا گۆزینـگ شۆڕ بۆتەوە.

١٤) عَنِ النَّبِيﷺ قَالَ: قَالَ اللهُ عِزَ وَجَلَّ: ((اَلنَّظَرُ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ إِبْلِيسِ، مَنْ تَرَكَهَا مَخَافَتِي أَبْدَلَهُ إِيمَاناً يَجِدُ حَلاَوَتَهُ فِي قَلْبِهِ))رواه

الطبراني والحاكم عن عبدالله بن مسعود ﷺ باسناد جيد.

**واته:** تەماشاكردنی ئافرەتی دەستنوێژ لێشكاو تیرێكە لە تیرەكانی شەیتان، وە یەكێك لەبەر من وازی لێ بێنێ و نەیكات ئەوا هەست بە شیرینی باوەڕ دەكات لەناو دڵیدا.

١٥) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((اَلْحَمَّامُ حَرَامٌ عَلَى نِساءِ أُمَّتِي))رواه الحاكم عن عائشة ﷺ بسند حسن.

**واته:** چوونە ناو حەمام قەدەغەیە لەسەر ئافرەتانی ئوممەتەكەم (مەبەست لە حەمامی گشتییە).

١٦) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((أَيُمَا رَجُلٍ مَسَّ فَرْجَهُ فَلْيَتَوضَأْ، وَأَيُمَا اِمْرَأةٍ مَسَتْ فَرْجَهَا فَلْيَتَوَضَأْ)) رواه أحمد والدار قطني عن ابن عمرﷺ بسند صحيح.

**واته:** هەر پیاوێك دەستی بەداوێنی كەوت با دەستنیوژ بگرێ، وە هەر ئافرەتێك دەستی بە داوێنی خۆی كەوت با دەستنوێژ بگرێ.

١٧) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((لاَ تَنْكَحُ الأَيِمُ حَتَى تُسْتَأْمَرْ، وَلاَ تُنْكَحُ اِلْبِكْرُ حَتَّى تَسْتَأْذِنْ))متفق عليه.

**واته:** بێوەژن تاكو فەرمانی پێنەدرێت، كچیش تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێت، مارەییان نایەت.

١٨) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ نَزْلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الرَّجُلُ يَفْضِي إِلَى اِمْرَأَتِهِ وَتَفْضِي إِلَيْهِ ثُمَّ يَنْشُرْ أَحَدُهُمَا

سِرَّ صَاحِبِهِ)) رواه مسلم وابوداود.

**واتە**: خراپترین کەس لە ڕۆژی دوایی‌دا لەبەردەم پەروەردگاردا، پیاوێکە دەچێتە لای خێزانی، یا ژنێکە دەچێتە لای مێردەکەی، لەدوایی دا یەکێکیان نهێنی ئەویترین دەدرکێنێ.

١٩) قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((لاَ يَخْلُونَ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ كَانَ الشَّيْطَانُ ثَالِثُهُمَا)) رواه البخاري.

**واتە**: هەرگیز نابێ ژن و پیاو بەیەکەوە بن، چونکە شەیتان سێهەمینیانە.

٢٠) قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لعائشة رضي الله عنها: ((يَا عَائِشَةُ إِرْفِقِي، فَإِنَّ اللهَ إِذَا أَرادَ بِأَهْلِ بَيْتٍ خَيْراً أَدْخَلَ عَلَيْهِمُ الرِّفْقُ))صحيح رواه أحمد.

**واتە**: ئەی عائیشە، نەرم و نیان بە، بەڕاستی خودای گەورە، ئەگەر ویستی چاکە بکات لەگەڵ خێزانێکدا، ئەوا نەرم و نیانیان بەسەردا دەڕژێنێ.

٢١) قال رسول اللهﷺ: ((الحَيَاءُ وَالإِيمَانُ قُرِنَا جَمِيعاً، فَإِذَا رُفِعَ أَحَدُهُمَا رُفِعَ الآخَرُ)).رواه الحاكم والبيهقي بسند حسن.

**واتە**: شەرم و باوەڕ پێکەوە جووتن، ئەگەر یەکێکیان نەما، ئەویتریشیان نامێنێ.

٢٢) قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((مَنْ كَانَتْ لَهُ أُنْثَى فَلَمْ يُئْذِهَا وَلَمْ يُهِنْهَا وَلَمْ يُؤْثِرْ عَلَيْهَا وَلَدَهُ، أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ))متفق عليه.

**واته:** هەرکەسێك کـچێکی هـەبوو زیندەبەچاڵی نـەکرد و، زوڵـم و ستەمی لێ نەکرد و کوڕەکەی بە گەورەتر دانەنا (واتە قیمـەت و سەنگی بەسەردا نەشکاندەوە) خوای گەورە ئەیخاتە بەهەشتەوە.

٢٣) ((زَوَّجَ جُذَامَ بِنْتَهُ خَنْسَاءَ، وَهِيَ كارِهَةٌ، فَأَتَتْ خَنْساءُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَرَدَّ نِكاحَها (أي فَسَخَهَا).))متفق عليه.

**واته:** جوزام خەنسای کچی بـەزۆر بەشـوودا، خەنـسایش هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ مارەبڕینەکـەی هەڵوەشاندەوە.

٢٤) قال ابن عمر رضي الله عنه: ((نَهَـى رَسُـولُ اللهِ ﷺ عَـنِ الـشغارِ)).رواه البخاري ومسلم.

**واته:** پێغەمبەر ﷺ ژن بەژنی قەدەغە کردووە.

٢٥) قال رسـول الله ﷺ: ((لَعَـنَ اللهُ اَلْمُحَلِـلَ وَالْمُحَلَـلَ لَـهُ))رواه ابوداود بسند صحيح.

**واته:** نەفرەتی خوا (لعنە) لەو کەسەبێ کـە مارەبـەجاش دەکـات و لەوەشی بۆی حەڵاڵ دەکات.

٢٦) قـالَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ : ((إِذا دُعِـيَ أَحَـدُكُمْ إِلى الوَلِيمَـةِ فَلْيَأْتِهَا))رواه البخاري ومسلم.

**واتــە:** ئەگـەر کەسـێکتان بانگێـشتی زەماوەنـد کـرا، بـا بـچێت (بەمەرجێك شتی حەرامی تێدا نەبێت).

---

٢٧) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((اللهَ اللهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّهُنَّ عَوانٌ فِي أَيْدِيكُم، أَخَذْتُموهُنَّ بِأَمانَةِ اللهِ))رواه النسائي بسند صحيح.

**واته:** توخوا ئاگاداری ئافرەتەکانتان بن (دووجار فەرمووی)، ئەوان لەژێر چاودێریتان دان و ئێوە بە ئەمانەتی خودا هێناوتانن.

٢٨) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((شِقْوَةُ اِبنِ آدَمَ فِي ثَلاَثٍ: اِلمسْكِنُ السّوء، والمَرْأَةُ السّوء، والمَرْكَبُ السّوء))صحيح الجامع الصغير وزيادته رقم ١٦.

**واته:** سێ شت دەبێتە مایەی خراپی و بەدبەختی بۆ مرۆڤ، ماڵێکی خراپ (واتە: تەنگ و ناڕێك بێ)، یان دراوسێی خراپی هەبێت یان دوور بێت لە مزگەوت، ژنێکی خراپ، سواریەکی خراپ (واتە سواریەکەی ئەوەندە خراپ بێت خاوەنەکەی سوودی لێ نەبینێ).

٢٩) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((لَوْ كُنْتُ آمَراً أَحَداً أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ، لأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِها.))صحيح الجامع الصغير للألباني.

**واته:** ئەگەر فەرمانم بکردایە کە یەکێ کڕنووش(سجدە) بەرێ بۆ یەکێکی تر، ئەوا فەرمانم دەدا کە ئافرەت سوجدە بەرێ بۆ مێردەکەی.

٣٠) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((خَيْرُ النِّساءِ إِذا نَظَرْتَ إِلَيْهَا سَرَّتْكَ، وَإِذا أَمَرْتَهَا أَطاعَتْكَ، وَإِذا غِبْتَ عَنْهَا حَفِظَتْكَ فِي نَفْسِهَا

وَمَالِكَ.))رواه احمد وابوداود والحاكم وصححه.

**واته:** چاکترین ئافرەت ئەو ئافرەتەیە کە سەیرت کرد دڵخۆشت بکات، کە فەرمانت پێکرد فەرمان بەرداریت بکات، ئەگەر دوورکەوتیەوە ناموس و ماڵت بپارێزێت.

٣١) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((إذَا دَعَا الرَّجُلُ إمْرَأَتَهُ إلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أنْ تَجِيءَ عَلَيْهَا فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا، لَعَنَتْهَا المَلائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ) متفق عليه.

**واته:** ئەگەر پیاو خێزانی خۆی بانگ کرد بۆ کاری سەرجێیی و بۆ کاری ژن و مێردایەتی و نەچووە لای و بێفەرمانی کرد، مێردەکەی ئەو شەوە بەتەنیایی بباتە سەرو لێی تورە بێت، ئەوا تا ڕۆژ دەبێتەوە فریشتەکان نەفرین(لعنة)ی لێ دەکەن تا بەیانی دەبێتەوە.

٣٢) قالَ رَسُول اللهﷺ: ((لاَ يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا حَاضِرٌ إلا بِإذْنِهِ)) متفق عليه.

**واته:** ڕەوا نییە بۆ هیچ ئافرەتێك کە بەرۆژووی سوونەت بێ و مێردەکەشی ئامادەبێت (واتە لەسەفەر نەبێت)، مەگەر مێردەکەی مۆڵەتی پێ بدات.

٣٣) قال رسول اللهﷺ: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَنْظُرُ إلى مَحَاسِنِ إمْرَأَةٍ ثُمَّ يَغُضُّ بَصَرَهُ إلاّ أَحْدَثَ اللهُ لَهُ عِبادَةً يَجِدُ حَلاوَتَها فِي قَلْبِهِ))

رواه احمد والطبراني بسند حسن.

**واتە**: هەر موسڵمانێك (جا نێر بێ یا مێ) لە غەفڵەتێكدا یان لە ناكاوێكدا چاوی بكەوێت بەجوانی ئافرەتێك دوایی ڕووی وەرگێڕا و چاوی پاراست (لەترسی خودا) خوای گەورە بە پەرستن بۆی حساب دەكات و هەست بە شیرینی و تام و چێژی دەكات لە دڵ و دەروونی دا.

٣٤) قالَ رَسُول اللهﷺ: ((لا يَخْلُونَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ))رواه البخاري.

**واتە**: با پیاوێك و ئافرەتێك بەتەنیا نەبن لەشوێنی چۆڵدا مەگەر مەحرەمێكیان لەگەڵ بێت.

٣٥) قال رسُول اللهﷺ: ((لا يَفْرِكُ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إنْ كَرِهَ مِنهَا خُلُقاً رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ))رواه مسلم.

**واتە**: هیچ باوەردارێكی پیاو بێزاری لە بەرامبەر هاوسەری دەرنەبڕێت، چونكە ئەگەر هەڵسوكەوتێكی ناڕێكی نواند، ئەوە هەڵسوكەوتی تری هەیە كە پەسند و جوان و ڕێكە.

٣٦) قال رسول اللهﷺ: ((لا تَحْلِفُوا بِآبائِكُمْ وَلا بِأُمَّهَاتِكُمْ وَلا بِالأَنْدادِ وَلا تَحْلِفُوا إلاَّ بِاللهِ وَتَحْلِفُوا الاَ وَأَنْتُمْ صادِقُون))رواه ابوداود بسند صحيح.

**واتە**: سوێند مەخۆن بەسەری باوك و دایكتانەوە، وە بەو شتانەی دەبنە هاوەڵ دانان بۆ خوای پەروەردگار، سوێند بەخوا بخۆن،

سوێند مەخۆن ئەگەر بەڕاستی نەبێت.

**٣٧) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ تُبَاشِرِ المَرْأَةُ المَـرْأَةَ فَتَنْعِتَهـا لِزَوْجِهَـا كَأَنَّهَا يَنظُرُ إِلَيْهَا))**رواه البخاري.

**واتـە:** بـا ئـافرەت بـەئافرەت نـەگات (واتــە لـەکاتی ڕووتیــدا) و ئەندامەکانی ببینێ، پاشان وەسفی ئەندامــەکانی بـۆ مێردەکـەی بکات، هەروەکو خۆی سەیری کردبێت.

**٣٨) قال رسول اللهﷺ: ((إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ أَتَزَيَّنَ لِلْمَرْأَةِ كَمَا أُحِبُّ أَنْ تَتَزَيَّنَ لِيَ المَرْأَةِ، لأَنَّ اللهَ يَقُـولُ: وَلَهُـنَّ مِثْـلُ الـذِي عَلَـيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ))**رواه ابن جرير وابـن ابـي حـاتم باسـناد صـحيح، انظـر صـحيح الجـامع الصغير للألباني.

**واتە:** پێم خۆشە خۆم بڕازێنمەوە بۆ ژنەکەم، هەروەك چۆن پێم خۆشە ئــەو خــۆی بڕازێنێتــەوە بــۆ مــن، چــونکە خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێ: ئافرەتــان مافیــان هەیــە بەســەر پیاوەکانیانــەوە بەوێنەی ئەو مافانەی پیاوان هەیانە بەسەر خێزانەکانیانەوە).

**٣٩) قال رسول اللهﷺ: ((إِنَّ لَكُمْ مِنْ نِـسَائِكُمْ حَقَـاً وَلِنِـسائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقَاً))**صحيح الجامع الصغير.

**واتە:** ئێوە مافتان بەسەر خێزانەکانتانــەوە هەیــە، خێزانەکانیــشتان مافیان بەسەر ئێوەوە هەیە.

**٤٠) قال رسول اللهﷺ: ((مَنْ كَانَ لَهُ إِمْرَأَتَانِ يَمِيلُ لأَحَدِهِمَا عَنْ**



الأُخـرَى، جَـاءَ يَـوْمَ القِيامَـةِ يُجَـرُّ إِحْـدَى شَـقَّيْهِ سَـاقِطاً أَوْ مَائِلاً))رواه الترمذي وصححه غيره.

**واتـه:** هەرکەسێ دوو ژنی هەبوو نۆبـەی یـەکێکیانی دەدا بـە ئـەوی تـردا لـە ڕۆژی دوایـیدا یـەکێ لەلایـەکانی ڕادەکێـشرێت کـە داکەوتووە یان لەسەر لا دێت.

٤١) قال رسـول الله ﷺ: ((مَـنْ كُـنَّ لَـهُ ثَـلاَثُ بَنَـاتٍ، يُـؤْوِيهِنَّ وَيَرْحَمُهُنَّ وَيَكْفِلُهُنَّ، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ الْبَتَّةَ))رواه احمد بسند جيد.

**واتـه:** هەرکەسێ سێ کچی هەبێت و بەخێویان بکـات و بـە بـەزەیی بێت لەگەڵیاندا و بیانگرێتە باوەشی خـۆی، ئـەوە بەهەشـتی بـۆ واجب دەبێت و ئەچێتە ناویەوە.

٤٢) قال رسول الله ﷺ: ((إِذَا صَلَّتِ الْمَـرْأَةُ خَمْـسَهَا، وَصَـامَتْ شَهْرَهَا، وَحَصَنَتْ فَرْجَهَـا، وَأَطَاعَـتْ بَعْلَهَـا، دَخَلَـتْ مِـنْ أَيِّ أَبْوابِ الْجَنَّةِ شَاءَتْ))رواه ابن حبان بسند صحيح.

**واتـه:** ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژەکان بکات، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، عەورەتی بپارێزێت لەخراپی، گوێڕایەڵی مێردەکـەی بکـات لە شتی شەرعیدا، ئەوا لەکام دەرگای بەهەشتەوە بیەوێ دەچـێتە بەهەشتەوە.

٤٣) قال رسول الله ﷺ: ((لِلْبِكْرِ سَبْعَةُ أَيَامٍ وَلِلثَّيِّبِ ثَلاثٌ ثُمَّ يَعُـدْ إِلَى نِسَائِهَا))رواه مسلم.

---



**واتە**: ئەگەر یەکێك ژنی هەبوو ویستی بیکاتە دووان یا زیاتر، ئەوە ژنی دووەم یا سێیەم یا چوارەم ئەگەر کچ بوو حەوت ڕۆژ لەگەڵی دەمێنێتەوە لەسەرەتادا (واتە لە ڕۆژی گواستنەوە تا حەوت ڕۆژ)، ئەگەر بێوەژن بوو ئەوە سێ ڕۆژ لەگەڵی دەمێنێتەوە.

٤٤) قال رسول اللهﷺ: ((نُهِيتُ أَنْ أَمْشِيَ عُرْيَانًا))حديث حسن رواه الطبراني.

**واتە**: لێم قەدەغەکراوە بەڕووتی بەڕێگادا بڕۆم.

٤٥) قال رسول اللهﷺ: ((أَرْبَعَةُ يُصْبِحُونَ فِي غَضَبِ اللهِ وَيُمْسُونَ فِي سَخَطِ اللهِ. قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الْمُتَشَبِّهُونَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ، وَالَّذِي يَأْتِي الْبَهِيمَةَ، وَالَّذِي يَأْتِي الذَّكَرَ يَعْنِي اللِّوَاطَ))رواه البيهقي والطبراني عن ابي هريرةرضي الله عنه باسناد صحيح.

**واتە**: چوار کەس بەیانیان و ئێواران لەناو قەهر و تووڕەیی خوادان. ووتم: ئەو چوارکەسانە کێن ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرمووی: ئەو پیاوانەی خۆیان دەبەنە سەر شێوەی ژنان و ئەو ژنانەی خۆیان دەبەنە سەر شێوەی پیاوان، ئەو کەسەی بچێتە لای گیاندار (چوارپێ)، ئەوەی دەچێتە لای پیاو (واتە نێربازی).

٤٦) قال رسول اللهﷺ: ((النِّكَاحُ مِنْ سُنَّتِي، فَمَنْ لَمْ يَعْمَلْ بِسُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي، وَتَزَوَّجُوا فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ))رواه ابن ماجه بسند حسن.

---



**واتـه**: هاوسەرگرتن لە سـوونـنەتی منـه، هەرکەسـێك لێـی لابـدات شوێن کەوتووی من نیە، هاوسەر بگرن لەبەر ئەوەی من دەمەوێ ژمارەتان لە هەموو گەلانی تر زیاتر بێت.

٤٧) قال رسول اللهﷺ: ((إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ مُهَاجِرَةً فِـرَاشَ زَوْجِهَـا لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تَرْجِعَ))رواه البخاري ومسلم.

**واتـه**: ئەگەر ئافرەتێك بەبێزاری جێی هاوسەرەکەی جێ بهێڵێت لێـی دوور بکەوێتەوە، فریشتەکان لەعنەت (نـەفرین)ی لیّ دەکـەن تـا دەگەڕێتەوە.

٤٨) قال رسول اللهﷺ: ((سَبْعَةٌ يَلْعَنُهُمُ اللهُ تَعَالَى وَلاَ يَنْظُرُ إِلَـيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَقُولُ اُدْخُلُوا النَّارَ، الْفَاعِـلُ وَالْمَفْعُـولُ بِـهِ (يَعْنِـي اللُّوَّاطَ)، وَنَاكِحُ الْبَهِيمَةِ، وَنَاكِحُ الأُمِّ وَبِنْتِهَا، وَنَـاكِحُ يَـدِهِ، إِلاَّ أَنْ يَتُوبُوا))حديث حسن رواه الطبراني.

**واتـه**: خودای پەروەردگار نەفرەتی (لعنە)ی لە حەوت جۆر ئادەمیزاد کردووە و بەچاوی بەزەیی تەماشایان ناکات، وە فـەرمان دەکـات بیـان بەنـە نـاو دۆزەخـەوە لەگـەڵ ئەوانـەی دەچـنە نـاو ئـاگر هەتاهەتایە، مەگەر پەشیمان ببنەوەو تەوبە بکەن:

یەکەم: ئەوانەی دەچنە لای نێر یان مێ لەدواوە.

دووەم : ئەو کەسەی بەکاری نێربازی رازیـیە لەگەڵی بکرێت.

سێیەم: ئەوانەی دەچنە لای چوارپێ.

چوارەم: ئەوانەی دەچنە لای دایك.
پێنجەم: ئەوانەی دەچنە لای کچی خۆیان.
شەشەم: ئەوانەی بەدەست خۆیان ڕەحەت دەکەن.

٤٩) قال رسول الله ﷺ: ((إذا ظهر الزنا والربا في قرية فقد أحلوا بأنفسهم عذاب الله))رواه الحاكم وقال صحيح الإسناد.

**واتە**: ئەگەر بەئاشکرا داوێن پیسی و ریبا(سوو) خورا لە هەر شار و دێهاتێکدا، ئەوا سزای خوایان لەسەر خۆیان سەپاندوە.

٥٠) قال رسول الله ﷺ: ((لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إلاّ كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ))رواه البخاري ومسلم.

**واتە**: نابێ پیاو لەگەڵ ژندا بەتەنها بمێنێتەوە یان بەتەنها دابنیشێ لەگەڵیدا، چونکە سێهەمینیان شەیتانە.

٥١) قال رسول الله ﷺ: ((كُتِبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ نَصِيبُهُ مِنَ الزِّنَا، فَهُوَ مُدْرِكٌ لاَ مَحَالَةَ الْعَيْنَانِ زِنَاهُمَا النَّظَرُ..))رواه مسلم وابوداود والترمذي.

**واتە**: هەموو ئادەمیزاکێك بەشی هەیە لە زیناو نووسراوە لەسەری، وە پێشی دەگات و دەربازبوونیش نییە لێی، مەبەست لە زینای بچوکە زینای چاو تێڕوانین و سەیرکردنی ئافرەتە.

٥٢) قال رسول الله ﷺ: ((مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ وَضَمَّ أَصَابِعَهُ))رواه مسلم.

---

**واته**: هەرکەسێ دوو کچ لەسەر ئاینی ئیسلام پەروەردە بکات، تاکو دەگەنە باڵغ بوون لە ڕۆژی دوایىدا من و ئەو کەسە بەیەکەوەین وەك ئەو دوو پەنجە، دوو پەنجەی جووت کرد.

٥٣) قال رسول اللهﷺ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا مِنْ رَجُلٍ يَدْعُو امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهَا فَتَأْبَى عَلَيْهِ إِلاَّ كَانَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ سَاخِطاً عَلَيْهَا حَتَّى يَرْضَى عَنْهَا))رواه مسلم.

**واته**: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەرکەسێ داوای سەرجێیی لە ئافرەتەکەی بکاو ئەویش خۆی لێ قەدەغە بکات، ئەوا خوای گەورە لەو ژنە دەڕەنجێت تاکو پیاوەکەی لەگەڵ ئاشت دەبێتەوە.

٥٤) عن عائشةﷺ قالت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ إِذَا حِضْتُ يَأْمُرُنِي أَنْ أَتَّزِرَ ثُمَّ يُبَاشِرُنِي))صحيح رواه الترمذي.

واتە: پێغەمبەری خواﷺ عادەتی وابوو کە دەکەوتمە بێنوێژییەوە فەرمانی پێ دەکردم کە کراسێك لەبەر بکەم لەسەریدا یاری لەگەڵ دەکردم.

٥٥) قال رسول اللهﷺ: ((إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ))رواه مسلم وابوداود.

**واته**: خۆشوشتن پێویستە ئەگەر ئاوی مەنی هاتەوە.

٥٦) قال رسول اللهﷺ: ((أَيُّمَا امْرَأَةٍ لَمْ يَنْكِحْهَا الْوَلِيُّ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَإِنْ أَصَابَهَا، فَلَهَا مَهْرُهَا

---

بِمَا أَصَابَ مِنهَا، فَإِنْ اشْتَجَرُوا فَالسُلْطَانِ وَلِيُّ مَنْ لا وَلِيُّ لَهُ))رواه ابن ماجه وابوداود بسند صحيح.

**واتە**: هەر ئافرەتێك سەرپەرشتەكەی مارەی نەكات، ئەوە مارەبڕینەكەی بەتاڵە (تا سێ جار ئەمەی گووت) جا ئەگەر چووە لای جیماعی لەگەڵدا كرد، ئەوە هەموو مارەیییەكەی بەردەكەوێت، جا ئەگەر سەرپەرشتیارەكانیش كێشەیان لەنێواندا دروست بوو، ئەوە دەسەڵاتدار سەرپەرشتیاری كەسێكە كە سەرپەرشتیاری نەبێت.

٥٧) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ))حديث رواه البيهقي وابن حبان.

**واتە**: مارەكردن دانامەزرێت تا سەرپەرشتیار و دوو شایەت ئامادە نەبن.

٥٨) قال رسول اللهﷺ: ((... إِنَّهُ لاَبُدَّ لِلْعُرْسِ مِنْ وَلِيمَةٍ))رواه أحمد والطبري.

واتە:... پێویستە بۆ بووك گواستنەوە خواردن بكرێت.

٥٩) قال رسول اللهﷺ: ((حَقُّ الزَّوْجِ عَلَى زَوْجَتِهِ أَنْ لَوْ كَانَتْ بِهِ قُرْحَةٌ فَلَمَسَتْهَا مَا أَدَّتْ حَقَّهُ))صحيح رواه أحمد.

**واتە**: مافی پیاو لەسەر خێزانەكەی ئەوەیە ئەگەر لاشەی چڵك و خوێنی پێوە بووبێت، ئەو بەزمانی بیلێسێتەوە، ئەوە مافی هێشتا نەداوە.

٦٠) قال رسول اللهﷺ: ((خَيْرُ النِّساءِ مَنْ تَسرُّكَ إذَا أَبْصَرْتَ وَتُطِيعَكَ إذَا أَمَرْتَ وَتَحْفَظَ غِيبَتَكَ فِي نَفْسِهَا وَمَالِكَ))

**واته**: باشترین ئافرەت ئەو ئافرەتەیە ئەگەر بیبینی دڵخۆشت بکات، وە ئەگەر فەرمان بکەی بە گوێت بکات و پارێزگاری لە خۆی و ماڵت بکات ئەگەر لەماڵ نەبوویت.

٦١) قال رسول اللهﷺ: ((... الْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَهِيَ مَسْؤُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا))رواه البخاري ومسلم.

**واته**: ئافرەت سەرپەرشتیارە لەماڵی پیاوەکەیدا، وەبەرپرسە لەسەر ئەوەی سەرپەرشتی دەکات.

٦٢) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ يَحِلُّ لإمْرَأَةٍ مُسْلِمَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تَحُدَّ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ إلاَّ عَلَى زَوْجِهَا أرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً))رواه البخاري ومسلم.

**واته**: حەڵاڵ نییە بۆ هیچ ئافرەتێکی موسڵمان کە باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبێت، کەوا تازیە بۆ هیچ مردوویەك بکات لەوسێ ڕۆژ زیاتر، مەگەر بۆ مێردەکەی خۆی، ئەوە چوار مانگ و دەڕۆژ دەیکات.

٦٣) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ يَحِلُّ لإمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تَأْذَنَ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَهُوَ كَارِهٌ، وَلاَ تَخْرُجَ وَهُوَ كَارِهٌ وَلاَ تُطِيعَ فِيهِ أَحَداً وَلا تُخْشِنَ بِصَدْرِهِ وَلاَ تَعْتَزِلَ فِرَاشَهُ وَلاَ تَضُرَّ

بِهِ فَإِنْ كَانَ هُوَ أَظْلَمَ فَلْتَأْتِهِ حَتَّى تُرْضِيهِ فَإِنْ هُوَ قَبِلَ فَبِهَا وَنِعْمَتْ وَقَبِلَ اللهُ عُذْرَهَا وَأَفْلَحَ مَحَبَّتُهَا وَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَإِنْ هُوَ أَبَى بِرِضَاهَا عَنْهَا فَقَدْ أَبْلَغَتْ عِنْدَاللهِ عُذْرُهَا))رواه البيهقي والحاكم وهو حديث حسن.

**واته**:حەڵاڵ نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبێت روخسەت بدات بەهیچ کەسێك لەماڵی پیاوەکەیدا و ئەو پێی ناخۆش بێت، وە نابێت گوێڕایەڵی هیچ کەسێك پێشی گوێڕایەڵی پیاوەکەی بخات و یان دڵی زامدار بکات، یان جێگای لێ جیابکاتەوە، وە نابێت لێی بدات، جا ئەگەر ئەو ستەمی لێ کرد ئەوە با ئەم بڕوات بۆ لای تا ڕازی دەکات، جا ئەگەر لێی ڕازی بوو ئەوە چاکە و خوایشی لێ ڕازی دەبێت و عوزری قبوڵ دەکات، پیاوەکەش سەرفراز دەبێت بە خۆشەویستی ئەم و هیچ تاوانی لەسەر نامێنێت، ئەگەر پیاوەکەی لێی ڕازی نەبوو ئەوە ئەم ئەوەی لەسەریەتی بەجێی هێناو عوزری خۆی گەیاندە لای خوای گەورە.

٦٤) قال رسول اللهﷺ: ((الْمُخْتَلِعَاتُ هُنَّ الْمُنَافِقَاتُ))رواه الترمذي بسند صحيح.

**واته**: ئەو ئافرەتانەی کە داوای تەڵاق دەکەن (خلع) لەمێردەکانیان بەڕاستی ئەوانە دووڕووەکانن.

---

٦٥) **قال رسول اللهﷺ: ((ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ، وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ وَالطَّلاقُ وَالرَّجْعَةُ))**حديث حسن رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه.

**واته:** سێ شت هەن ڕاستیان ڕاستیە و گاڵتەشیان هەر ڕاستیەیە، ژن مارەکردن و تەڵاق دان و گێڕانەوە.

٦٦) **قال رسول اللهﷺ: ((لاَ طَلاَقَ وَعِتَاقَ فِي إِغْلاَقٍ))**رواه احمد وابوداود بسند صحيح.

**واته:** تەڵاق دان و ئازادکردنی کۆیلە لەکاتی (إغلاق) دا نییە.

إغلاق: تورەبوون و زۆر لێکردن و شێتی.

٦٧) **قال رسول اللهﷺ: ((لاَ تَضْرِبُوا الجِزْيَةَ عَلَى النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ وَلاَ تَضْرِبُوهَا إِلاَّ عَلَى مَنْ جَرَتْ عَلَيْهِ المُوسى))**صحيح رواه البيهقي.

**واته:** سەرانە لە ئافرەتان و منداڵان مەسێنن، کەسێك باڵغ نەبووبێت لە نێرینە سەرانەی لێ مەسێنن.

٦٨) **قال رسول اللهﷺ: ((لَنْ يَفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوا أَمْرَهُمْ إِمْرَأَةٌ))**رواه البخاري والترمذي والنسائي.

**واته:** هیچ میللەتێك سەرفراز نابن کە فەرمانی خۆیان بدەنە دەستی ئافرەت.

٦٩) **قال رسول اللهﷺ: ((إِنَّ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِهَا الْمَرْأَةُ**

**الصَّالِحَةُ**))صحيح رواه النسائي.

**واتە**: دنیا کالاّ و شتومەکە، چاکترین کالاّ و شت و مەك لـە دنیـادا ئافرەتی چاك و بڕواداره.

٧٠) قال رسول الله ﷺ: ((**حُبِّبَتْ إِليَّ مِنَ الدُّنْيَا النِّسَاءِ وَالطِّيبُ وجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاَةِ**))رواه النسائي بسند صحيح.

**واتە**: لە دنیادا ئەم دوو شتەم لەلای خۆشەویست کراون: ئـافرەت و بۆن خۆشی، وە لە نوێژیشدا چاوو دڵم ڕۆشن دەبێتەوە.

٧١) قال رسول الله ﷺ: ((**إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَارَسُولَ اللهِ، أَفَرَأَيْتُ الحَمْوَ؟ قَالَ: الحَمْوُ المَوْتُ.**))رواه البخاري.

**واتە**: قەد نەکەن لە ئافرەتـان بـچنە ژوورەوە بەتـەنیا، پیاوێـك لـە ئەنصاریەکان وتی: ئەی ئەگەر ئەو کەسە شوبرای بوو؟ فەرمووی: ئەوە هەر مردنە.

٧٢) قال رسول الله ﷺ: ((**خَيْرُ النِّسَاءِ رَكِبْنَ الإِبِلَ صَالِحَ نِسَاءِ القُرَيْشِ أَحْنَاهُ عَلَى وَلَدٍ فِي صِغْرِهِ، وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذاتِ يَدِهِ**))رواه البخاري.

**واتە**: باشترین ئافرەتێك سـواری وشـتر بووبێـت، چـاکترین ئـافرەتی قوڕەیـشە، خـاوەن سـۆز و خۆشەویـستین بـۆ منداڵـەکانیان و، پاسەوانی ماڵی مێردەکانیشیانن.

٧٣) عن عائشة ﵂ قالت: ((إنَّ اِمْرَأَةً قالت: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ، أَقُولَ إِنَّ زَوْجِي أَعْطَانِي مَا لَمْ يُعْطِنِي. قال رسول الله ﷺ: الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطِ كَلاَبِسِ ثَوْبِي زُورٍ))متفق عليه.

**واته**: ئافرەتێك بە پێغەمبەری فەرمووﷺ: مـن دەڵـێم مێردەکـەم پارەم دەداتێ لەکاتێکدا کـە وا نییـەو نامـداتێ؟ پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: تێربوو تێرکراو بە شتێك کە پێشی نەدراوە ئەوە وەکـو لەبەرکردنی جلێکی درۆ وەهایە.

٧٤) ((نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا أَوْ عَلَى خَالَتِهَا))رواه البخاري ومسلم.

**واته**: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە ئافرەت بەسەر خوشکی دایـك و خوشکی باوك مارەبکرێت (واتە پوور).

٧٥) قال رسول الله ﷺ: ((إِذَا اِسْتَعْطَرَتِ الْمَرْأَةُ فَخَرَجَتْ عَلَى الْقَوْمِ لِيَجِدُوا رِيحَهَا فَهِيَ كَذَا وَكَذَا (أَيْ الزَّانِيَة).))رواه احمد بسند صحيح.

**واته**: ئەگەر ئافرەت خۆی بۆن خۆش کرد و ڕۆیشتە دەرەوە بـۆ لای کەسانێك کە بۆنەکەی بکەن، ئەوا ئاواو ئاوایە (واتە زیناکەرە).

٧٦) قال رسول الله ﷺ: ((عُذِبَتْ إِمْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ، حَبَسَتْهَا مَاتَتْ جَوْعًا فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ))رواه البخاري.

**واته**: ئافرەتێك سزادرا لەسەر پشیلەیەك کـە بەنـدی کردبـوو (واتـە

خواردن و خواردنەوەی نەئەدا پێی) هەتا بەبرسێتی مرد، بۆیە بەهۆی ئەو پشیلەیەوە چووە ناو ئاگری دۆزەخ.

٧٧) تقول عائشة أم المؤمنين رضي الله عنها: ((إِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ إِذَا دَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ قَامَ إِلَيْهَا فَرَحِبَ بِهَا وَقَبَلَهَا وَأَجْلَسَهَا فِي مَجْلِسِهِ))متفق عليه.

**واته**: دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە (خودا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت: هەرکاتێك فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ سەری لە پێغەمبەر ﷺ بدایە، پێغەمبەر ﷺ لەبەری هەڵدەستاو پێشوازی لێدەکرد و، ماچیشی دەکرد و، لە تەنیشت خۆیەوە دای دەنا.

٧٨) قال رسول الله ﷺ: ((إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ مِنْهَا إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ))رواه أحمد وأبوداود.

**واته**: ئەگەر یەکێکتان بەنیاز بوو ئافرەتێك بخوازێت و بوار هەبوو ببینێ، با سەیری بکات.

٧٩) قال رسول الله ﷺ: ((إِذَا أَتَاكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ))حديث حسن رواه الترمذي وابوداود والحاكم.

**واته**: ئەگەر یەکێك هات بۆ خوازبێنی کچەکەتان، و ئێوەش لە ئاین و ڕەوشتی ڕازی بوون، ئەوا بیاندەنێ، بەڵام ئەگەر واتان نەکرد ئەوا ئاژاوەو خراپەکاری لەسەر زەویدا بلاّو دەبێتەوە.

٨٠) قال رسـول اللهﷺ: ((يَانِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ بِقَرْنِ شَاةٍ))متفق عليه.

**واتــه**: ئــەی نافرەتــانی موســڵمان! بــا هــیچ دراوســێیەك ژنــە دراوسێیەکەی بێڕێز سەیر نەکا و شتی یەکتر بەکەم نەزانن.

٨١) عن أسود قال: سألت عائشة ﵂: ما كان النبيُّﷺ يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: ((كَانَ يَكُونُ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ (فِي خِدْمَتِهِمْ)، فَإِذَا حَضِرَتِ الصَّلاَةُ خَرَجَ إِلى الصَّلاَةِ))رواه البخاري.

**واتە**: لــە ئەسودەوە دەگێڕنــەوە، ڕەزای خــوای لەســەر بێــت، کــە وتوویەتی: لە حــەزرەتی عائیــشەم پرســیار کــرد: پێغەمبــەرﷺ لەماڵــەوە چــی دەکــرد؟ ئــەویش فــەرمووی: لەماڵــەوە خزمــەت دەکات و بەدەم خێزانیەوەیە (واتــە یارمــەتی دەدات لــە ئــیش و کاری ناوماڵدا) کە کاتی نوێژیش هات، دەڕوات بۆ مزگــەوت بــۆ نوێژی جەماعەت.

٨٢) تَقُولُ أسماء بنت أبي بكر: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ، قُلْتُ: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهِيَ رَاغِبَةٌ(أَيْ تَرْغَبُ زِيَارَتِي) أَفَأَصِلُ أُمِّي؟ قَالَ: نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ))متفق عليه.

**واتە**: ئەسمای کچی ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێت: دایکم هاتە لام و ئەوکاتە باوەڕی نەهێنابوو، پرســیارم لــە پێغەمبــەری خــوا

کرد و وتم: دایکم هاتووه بۆ لام و ئەیەوێت سەردانم بکات، ئایا پێشوازی لێ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، سیلەی ڕەحم لەگەڵ دایکتدا بەجێ بهێنە.

٨٣) قال رسول الله ﷺ: ((إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْمَسْجِدَ فَلاَ تَمَسَّ طِيبَاً))رواه مسلم.

**واتە**: ئەگەر یەکێکتان (مەبەستی لە ئافرەتانە) ئامادەی مزگەوت بوو، با بۆنی خۆش بەکار نەیەنێت.

٨٤) قال رسول الله ﷺ لأمرأةٍ: ((زَوْجُكَ وَوَلَدُكَ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَيْهِمْ))رواه البخاري عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه.

**واتە**: پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتێکی فەرموو: زەکاتەکەت بدە بە مێردەکەت و کوڕەکەت، چونکە ئەوان لەپێشترن لەوانەی کە زەکاتت پێ داون.

٨٥) قال رسول الله ﷺ: ((مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ لاَ يُؤَدِّي مِنْهَا زَكَاتَهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صُفِحَتْ لَهُ صَفَائِحُ مِنْ نَارٍ فَيُكْوى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينَهُ وَظَهْرُهُ))رواه ابوداود والنسائي بسند حسن.

**واتە**: هەر خاوەن زێڕ و زیوێك زەکاتی نەدا، زێڕ و زیوەکەی لەڕۆژی دواییدا دەکرێتە پارچەی پان لە ئاگر و لاتەنیشت و نێوچاوان و پشتی پێ داخ دەکرێ.

٨٦) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رسولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ



ثُمَّ يَجْعَلُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا ثَوْبَاً يَغْنِي الفَرْجَ))رواه أحمد بسند صحيح.

**واتە**: پێغەمبەرﷺ گەمەو یاری لەگەڵ دەکرد و بەڕۆژوویش بوو، لەنێوان خۆی و ئەودا پەڕۆیەکی لەسەر فەرجی دادەنا.

٨٧) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَرَادَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يَقْبِلَنِي، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمَةٌ! فَقَالَ: وَأَنَا صَائِمٌ، ثُمَّ قَبِلَنِي))رواه احمد

**واتە**: پێغەمبەرﷺ ویستی ماچم بکات، منیش پێم گوت بەڕۆژووم! ئەویش فەرمووی: منیش بەڕۆژووم، لەپاشان ماچی کردم.

٨٨) أَنَّ اِمْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ رضي الله عنها فَقَالَتْ: أَتَقْضِي إِحْدَانَا الصَّلاَةَ أَيَّامَ مَحِيضِهَا؟ فَقَالَتْ عائشة: أَحَرُورِيَةٌ أَنْت؟ قَدْ كَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ ثُمَّ لاَ تُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ))رواه البخاري ومسلم.

**واتە**: ئایا نوێژەکانمان بگێڕینەوە کاتێك کە بێنوێژ بووین؟ عائیشە پرسی: ئایا تۆ خەڵکی (حروریە)ی،-دێیەکە لە نزیك مەککە و یەکەم کۆبوونەوەی خەواریجەکانی تیا بەسترا، لێرە مەبەستی ئەوەیە کە ئەمە ڕای خەواریجە-، ئێمە لەکاتی کە بێنوێژ دەبووین لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ ئەمری پێ نەدەکردین نوێژەکان بگێڕینەوە.

٨٩) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ تَصُومُ المَرْأَةُ يَوْمَاً وَاحِدَاً وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ إِلاَّ رَمَضَانَ))رواه أحمد والبخاري ومسلم.

---

**واته**: نابێ ئافرەت ڕۆژێـك ڕۆژووی سـوننەت بگـرێ تـا پرسـی بـە مێردەکەی نەکا تەنها مانگی ڕەمـەزان نـەبێ (چـونکە مـانگی ڕەمەزان واجبە).

٩٠) قال رسول اللهﷺ: ((لَـيْسَ مِنَّـا مَـنْ ضَـرَبَ الخُـدُودَ وَشَـقَّ الجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَةِ الجَاهِلِيَّةِ))رواه البخاري ومسلم والترمذي.

**واته**: هەریەکێك لەخۆی بـداو یەخـەی خـۆی بـدڕێ و ڕەش پـۆش و شـتی نادروسـت بکـا لەئێمـە نیـیـە (واتـە دوورە لـە کۆمـەڵی موسڵمانان).

٩١) إِنَّ رَسُولَ اللهِﷺ بَرِيءٌ مِنَ الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ))رواه البخاري ومسلم.

**واته**: پێغەمبەرﷺ لەوانە بەرییە: قیـژەو هـاوار و پـرچ ڕنینـەوەو یەخە دادڕین ئەنجام دەدەن.

٩٢) عَـنْ أُمِّ عَطِيَّـةَ الأَنْـصَارِيَّةِ﵂ قَالَـتْ: نُهِينَـا عَـنْ اِتْبَـاعِ الجَنَائِزِ..))رواه البخاري ومسلم.

**واته**: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردین دوای جەنازە بکـەویت (ئەمـە تایبەتە بە ئافرەتان).

٩٣) قـال رسـول اللهﷺ: ((قَـدْ أُذِنَ لَكُـنَّ أَنْ تَخْـرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ))رواه مسلم.

**واته**: ئەوا ڕێگە درا کە بۆ پێویستییەکانتان لەماڵ دەربچن.

---



٩٤) قال رسول اللهﷺ: ((إِذَا اِسْتَأْذَنَكُمْ نِسَاؤُكُمْ بِاللَّيْلِ إِلى المَسْجِدِ فَأْذَنُوا))متفق عليه.

**واته:** ئەگەر خێزانەکانتان مۆڵەتیان خواست بەشەو بچنە مزگەوت، مۆڵەتیان بدەن.

٩٥) جَاءَتْ اِمْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللهِ ذَهَبَ الرِّجَالُ بِحَدِيثِكَ فَاجْعَلْ لَنَا مِنْ نَفْسِكَ يَوْماً نَأْتِيكَ فِيهِ تُعَلِّمُنَا مِمَّا عَلَّمَكَ اللهُ فَقَالَ اِجْتَمِعْنَ فِي يَوْمَ كَذَا وَكَذَا فِي مَكَان كَذَا وَكَذَا فَاجْتَمَعْنَ فَأَتَاهُنَّ رَسُولُ اللهِﷺ فَعَلَمَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَهُ الله))رواه البخاري.

**واته:** ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، وتارەکانت تەنها بۆ پیاوانە، ڕۆژێکیش بۆ ئێمە دیاری بکە تا بێینە خزمەتت، تا ئەوەی خوای پەروەردگار فێری کردووی فێری ئێمەشی بکە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە فلان ڕۆژ و فلان ڕۆژ کۆببنەوە، ئەوانیش لەشوێنی دیاریکراو کۆبوونەوەو پێغەمبەریشﷺ ئەوەی خوای پەروەردگار فێری کردبوو، فێری ئەوانیشی کرد.

٩٦) كنّ نساء مؤمنات يشهدن مع رسول الله ﷺ صلاة الفجر متلفعات بمروطهن (مغبطات الرؤس باثوابهنّ) ثم ينقلبن إلى بيوتهن حين يقضين الصلاة لا يعرفهن أحد من الغلس (ظلمة

آخر الليل بعد طلوع الفجر).رواه البخاري ومسلم.

**واته**: ئافرەتە موسڵمانەکان لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ ئامادەی نوێژی بەیانیان دەبوون و، بە پۆشاکەکانیان داپۆشرابوون، پاش بەجێهێنانی نوێژ، بەرەو ماڵەکانیان دەگەڕانەوە، لەبەر تاریکی شەو کەس نەیدەناسینەوە.

٩٧) قال رسول اللهﷺ: ((.. وَلاَ تَنْقِبِ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلاَ تَلْبِسِ الْقَفَازَيْنِ))رواه البخاري وابوداود.

**واتە**: نابێ ئافرەت لەکاتی ئیحرامدا نیقاب بکات و دەستکێش لەدەست بکات.

٩٨) عن الربيع بنت معوذ رضي الله عنها قالَتْ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَسْقِي الْقَوْمَ وَنَخْدِمُهُمْ وَنَرُدُّ الْقَتْلَى إِلَى الْمَدِينَةِ، وَفِي رِوَايَةٍ: وَنُدَاوِي الكَلْمَى (أَيْ الجَرْحَى).رواه البخاري.

**واتە**: بەشداری شەڕمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ، ئاومان دەدا بە خەڵکەکەو خزمەتمان دەکردن و کوژراوەکانیشتمان بۆ مەدینە دەبردنەوە، لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە: بریندارەکانیشمان تیمار دەکردن.

٩٩) عن عائشة رضي الله عنها قالَتْ: اِسْتَأْذَنْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْجِهَادِ، فقال: ((جِهَادُكُنَّ الْحَجُّ)).رواه البخاري.

**واتە**: داوام لە پێغەمبەرﷺ کرد ڕێگام بدا بۆ جیهاد، فەرمووی:

حەج جیهادی ئێوەیە.

١٠٠) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ تُسَافِرْ إِمْرَأَةٌ سَفَراً ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَصَاعِداً إِلاَّ مَعَ أَبِيهَا أَوْ أَخِيهَا أَوْ اِبْنِهَا أَوْ زَوْجِهَا أَوْ ذِي مَحْرَمٍ))رواه البخاري.

**واتە:** نابێ ئافرەت لەسێ ڕۆژ بەدواوە بەتەنها سەفەر بکات، مەگەر لەگەڵ باوکی یا کوڕی یا برای یا مێردی یان مەحرەمێکی تر بێت.

١٠١) قال رسول اللهﷺ: ((خَمْسٌ مَنْ قُبِضَ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ فَهُوَ شَهِيدٌ... والنفساءُ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُوَ شَهِيدٌ))رواه النسائي بسند صحيح.

**واتە:** پێنج جۆرە کەس شەهیدن.. ئەو ئافرەتەش بەخوێنی منداڵ بوون دەمرێت شەهیدە.

١٠٢) قال رسول اللهﷺ: ((إِنَّ اللهَ حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعِ مَا حَرَّمَ مِنَ النَّسَبِ)) صحيح رواه الترمذي.

**واتە:** خوای پەروەردگار ئەوەی بە زاوزێ و خزمایەتی حەرامی کردبێ، بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرامی کردووە.

١٠٣) عن عائشة رضي الله عنها قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِي ﷺ وَلاَ نَرَى إِلاَّ الحَجَّ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِسَرْفٍ، أَوْ قَرِيباً مِنْهَا حِضْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: أَنَفِسْتِ؟ (يَعْنِي

الحِيضَةَ) قَالَتْ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: إنَّ هَذا شَيْءٌ كَتَبَهُ اللهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاقْضِي مَا يَقْضِي الحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِي، قَالَتْ: وَضَحَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ))رواه البخاري ومسلم.

**واته**: لەگەڵ پێغەمبەرﷺ سەفەری حەجمان کرد، کاتێك لە (سرف) بووین یا نزیکی ئەوێ بووین بێنویژ بووم، پێغەمبەرﷺ هاتە سەرم و من دەگریام، بەمنی گوت: ئایا بێنوێژ بوویت؟ منیش گوتم: بەڵێ، ووتی: ئەوە خوای پەروەردگار لەسەر کچانی حەزرەتی ئادەمی نووسیوە، حاجیەکان چی دەکەن تۆش وابکە، تەنها تەوافی بەیت مەکە تا پاك دەبیتەوە.

١٠٤) قال رسول اللهﷺ: ((إذَا أَنْفَقَتِ المَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ.))متفق عليه.

**واته**: ئەگەر ئافرەت خواردن و شت و مەك لەماڵەکەی ببەخشێت، بەمەرجێك زیادەڕەوی تێدا نەکات، بۆ خۆی پاداشتی بەخشینەکەی دەست دەکەوێت و هاوسەرەکەیشی پاداشتی پەیداکردنەوەی دەست دەکەوێت.

١٠٥) قال رسول اللهﷺ: ((تَصَدَّقْنَ يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارَ وَلَوْ مِنْ حِلِيِّكُنَّ))متفق عليه.

**واته**: ئـەی ئافرەتـانی (انـصار) خێـر و خێـرات بکـەن، ئەگـەر لـە خشڵەکانیشتان بێت.

١٠٦) قال رسول اللهﷺ: ((أَبْغَـضُ الحَـلاَلِ إِلى اللهِ الطَّـلاقُ))رواه ابوداود بسند صحيح.

**واته**: ڕق لێ بووەوەترین حەڵاڵ لای خودای پەروەردگار، تەڵاقە.

١٠٧) عن أبي هريرة ﷺ قال: أَتَى جِبْرِيلُ النَّبِـيَّ ﷺ فَقَـالَ: يَـا رَسُولَ اللهِ هذِهِ خَدِيجَةُ إِذَا أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيْهَا الـسَّلامَ مِـنْ رَبِّهَـا وَمِنِّي وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الجَنَّـةِ مِـنْ قَـصَبٍ لاَ صَـخَبَ فِيـهِ وَلاَ نَصَبَ))متفق عليه.

**واتــه**: حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ ووتی: ئـەی پێغەمبەری خوا، ئەوە خەدیجەیە، ئەگەر هاتە لات سڵاوی خـوا و منی پێ بگەیەنە، وە مزگێنی کۆشکێکی لە مرواری پێ بدە لـە بەهەشتدا کە نە دەنگەدەنگ و نە ماندووبوونی تێدایە.

١٠٨) قـال رسـول اللهﷺ: ((الـسَّاعِيَ عَلَـى الأَرْمِلَـةَ وَالِمـسْكِينِ كَالُمجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ))رواه البخاري.

**واتــه**: هەرکەس دەستی خێری بگاتە بێوەژن و هەژار، وەك ئەوە وایە لەپێناوی خوادا جیهادی کردبێت.

١٠٩) قال رسول اللهﷺ: ((إِنِّي لاَ أُصَافِحُ النِّـساءَ..)) رواه الترمـذي بسند صحيح.

**واتە:** من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم.

١١٠) عن عمّ حرام بن حكيم أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: مَا يَحِلُّ لِي مِنْ اِمْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: ((لَكَ مَا فَوْقَ الإِزَارِ))رواه ابوداود بسند صحيح.

**واتە:** مامی حەرامی کوڕی حەکیم پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کرد: کاتێ خێزانم بێنوێژ بوو، چی بۆ من حەڵاڵە لەگەڵیدا بیکەم؟ ئەویش فەرمووی: بۆت دروستە لەسەر کراسی یاری لەگەڵ بکەی (واتە نابێ جیماعی لەگەڵ بکەی).

١١٢) قال رسول اللهﷺ: ((... إِطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ))رواه مسلم.

**واتە:** لەکاتی شەوڕەودا(معراج) سەیری دۆزەخم کرد، بینیم زۆرینەی لە ئافرەتان بوون.

١١٣) قال رسول اللهﷺ: ((لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيهِ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى))رواه البخاري ومسلم.

**واتە:** عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷠ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دایکم مرد و ڕۆژووی مانگێکیش قەرزارە، جا ئایا بۆی بگێڕمەوە؟ فەرمووی: ئەگەر دایکت قەرزار بوایە ئایا

بۆت دەبژاردەوە؟ ووتی: بەڵێ. پێغەمبەرﷺ فەرموی: کەواتە قەرزی خوا مافی بژاردنەوەی زیاترە.

١١٤) قال رسول اللهﷺ: ((مَنْ رَزَقَهُ اللهُ امْرَأَةً صَالِحَةً فَقَدْ أَعَانَهُ عَلَى شَطْرِ دِينِهِ، فَلْيَتَقِ اللهَ فِي الشَّطْرِ الثَّانِي))رواه الطبراني والحاكم وقال صحيح الإسناد.

**واتە**: هەرکەسێ خوای پەروەردگار ژنێکی خواناسی پێبەخشی، ئەوا خوای گەورە یارمەتی داوە بۆ ئەوەی نیوەی ئاینەکەی بەڕێوە ببات، با بۆ نیوەکەی تری پارێزگاری بکا و شەرم لەخوا بکا.

١١٥) قال رسول اللهﷺ: ((... وَنِساءُ كَاسِياتٌ، عَارِيَاتٌ، مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ البُخْتِ المَائِلَةِ، لاَ يَدْخُلْنَ الجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَأَنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا))رواه مسلم.

**واتە**: هەندێ ژن هەن پۆشتە و ڕووتن، بەلەنجەولارن، سەریان وەك پۆپەڵەی لای حوشتر وایە، ئەوانە ناچنە بەهەشت و بۆنیشی ناکەن، بەڕاستی بۆنی بەهەشت ئەوەندە و ئەوەندە دەڕوات.

١١٦) قالت عائشة رضي الله عنها: وَلاَ وَاللهِ مَا مَسَّتْ يَدُهُﷺ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ فِي المُبَايَعَةِ، مَا بَايَعَهُنَّ إلاَّ بِقَوْلِهِ قَدْ بَايَعْتُكِ عَلَى ذَلِكَ))رواه البخاري.

**واتە**: عائیشە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەفەرموێ: (واللە)

پێغەمبەرﷺ قەت دەستی نەداوە لە دەستی هیچ ئافرەتێك لەکاتی (بیعە) وەرگرتندا، بەڵکو هەر بە قسە (بیعە)ی لێ وەرگرتوون، دەیفەرموو: ئەوەیە بەڵێنم پێدای لەسەر ئەو شتە.

١١٧) قال رسول اللهﷺ: ((مَا مِنْ إِمْرَأَةٍ تَضَعُ ثِيابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا إِلاَّ هَتَكَتِ السِّتْرَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ رَبِّها))رواه الترمذي بسند صحيح.

**واتە:** هەر ئافرەتێك پۆشاکی خۆی جگە لە ماڵی مێردی دابنێ و لەوێ لەبەر خۆی بکاتەوە، ئەوە پەردەی شەرمی لەنێوان خۆی و خوای گەورەی پچڕاند.

١١٨) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ تَبِيعُوا الْمُغَنِّيَاتِ وَلاَ تَشْتَرُوهُنَّ وَلاَ تُعَلِّمُونَهُنَّ وَلاَ خَيْرَ فِي تِجَارَةٍ فِيهِنَّ وَثَمَنَهُنَّ حَرامٌ، فِي مِثْلِ هَذا أَنْزَلَتْ هذِهِ الأَيَةُ: وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ))رواه الترمذي بسند صحيح.

**واتە:** کەنیزەکی گۆرانیبێژ مەکڕن و مەفرۆشن و فێری خوێندەواریان مەکەن و بازرگانیان پێوە مەکەن، نرخیان حەرامەو لەبەر ئەم جۆرە شتە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ).

١١٩) عن أنس رضي الله عنه قال: رأى النبي ﷺ النِّسَاءَ وَالصِّبْيَانَ مُقْبِلِينَ مِنَ العُرْسِ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ مُمَثِّلاً فَقَالَ: ((اللهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ)) قالها ثلاث مرار. رواه البخاري.

**واته**: پێغەمبەرﷺ چاوی بە کۆمەڵێك ژن و منداڵ کەوت کە لەشایی‌یەك هاتبوونەوە، ئەوەبوو بەپێوە وەستاو پێیانی فەرموو: ئێوە لە خۆشەویست ترین کەسن بەلامەوە.. سێ جار ئەوەی فەرموو.

١٢٠) قال رسول اللهﷺ: ((**لاَ تُنْفِقْ إمْرَأَةٌ شَيْئاً مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا إلاَّ بِإذْنِ زَوْجِهَا، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَلاَ الطَّعَامَ؟ قَالَ: ذاك أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا**))رواه الترمذي بسند جيد.

واتە: ژن لەماڵی مێردەکەی هیچ شتێك بەبێ ئیزنی مێردەکەی نەبەخشێت، گوترا ئەی پێغەمبەری خوا، خواردنیش نابێ ببەخشێت؟ فەرمووی: خواردن باشترین ماڵ و سامانمانە.

١٢١) عن زوجة أبي اسحاق قالت: **أَنَّهَا دَخَلَتْ عَلَى عَائِشَةَ أَمِّ الْمُؤْمِنِينَ**رضي الله عنها **وَكَانَتْ (أَيْ إمْرَأَةُ أَبِي إسْحاق) شَابَّةٌ يُعْجِبُهَا الجَمَالُ، فَقَالَتْ: المَرْأَةُ تَحِفُّ جَبِينَهَا لِزَوْجِهَا؟ فَقَالَتْ عَائِشَةٌ**رضي الله عنها: **أَمِيطِي عَنْكَ الأَذَى مَا اسْتَطَعْتِ**))رواه الطبرى عن ابي اسحاق، انظر فتح الباري شرح صحيح البخاري.

**واته**: خێزانی ابی اسحاق چووە لای دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە ئافرەتێکی زۆر جوان بوو، پرسیاری کرد ئایا ئافرەت دەم و چاوی بکا بۆ مێردەکەی جائیزە؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر دەتوانی ئەو مووانە لادە (واتە:

---

بەتاشین، چونکە هەڵکەندن حەرامە بەمووکێش یا هەر شتێکی تر، وە ئەم دەم و چاو کردنە بەهیچ جۆرێك بۆ ئافرەتانی شوونەکردوو جائیز نیە).

١٢٢) قال رسول اللهﷺ لأسماء: ((يَا أَسْمَاءُ إِنْ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يَرَى مِنْهَا إِلاَّ هَذَا وَهَذَا (وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَيْهِ).))رواه ابوداود وحديث حسن بجميع طرقه.

**واته:** ئەی ئەسما، ئەگەر ئافرەت باڵغ بوو (واتە کەوتە حەیزەوە)، ئەوا بۆی دروست نیە هیچ شوێنێکی ببینرێ مەگەر ئەمەو ئەمە نەبێت (پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بۆ دەم و چاوو و هەردوو دەستی کرد).

١٢٣) قال رسول اللهﷺ: ((إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلاَةِ، وَعَنِ الْحُبْلَى والرَّضِعِ الصَّوْمِ))رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه وسنده جيد.

**واته:** خوای گەورە ڕۆژووگرتن و نیوەی نوێژی لەسەر سەفەرکەر هەڵگرتووە، هەروەها ڕۆژووگرتنی لەسەر ئافرەتی سکپڕ و شیردەر هەڵگرتووە.

١٢٤) عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِﷺ فَلَمْ يَنْهَانَا))رواه مسلم.

**واته:** لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ عەزلمان دەکرد (واتە مەنعی



تەبیعی، کاتێك پیاو دەچووە لای خێزانی لە لوتکەی چێژوەرگرتن تۆوەکەی (نگفە) دەڕشت) وە ئایەتی قورئانیش دادەبەزی و پێغەمبەرﷺ قەدەغەی نەکردین کاتێك ئەم هەواڵەی پێگەیشت.

لە کۆڕی ئیمامی عومەردا باسی ئەم (عزل)ەیان کرد، پیاوێك ووتی: دەڵێن ئەم کارە زیندەبەچاڵی بچووکە (المؤدە الصغری)، ئیمامی عەلی فەرمووی: ئەمە نابێتە زیندەبەچاڵی بچووك، تاوەکو بە حەوت قۆناغ تێنەپەڕێت، تا دەبێتە کەمە قوڕێك، پاشان دەبێتە نوتفەیەك، پاشان دەبێتە (علقە) پاشان دەبێتە (مچغە) و پاشان دەبێتە ئێسقان و پاشان گۆشت دایدەپۆشێ، ئینجا دەبێتە دروستکراوێکی تەواو، ئیمامی عومەر فەرمووی: ڕاستت فەرموو، خوا تەمەنت درێژ بگات. بەهۆی ئەم بەڵگەیە مەنعی تەبینی دروستە، بە مەرجێك ڕازیبوونی ژنی لەگەڵ بێت، چونکە ئەویش مافی هەیە لە منداڵ بوون و چێژوەرگرتن. ئیمامی عومەر (عزل)ی قەدەغەکرد گەر بەبێ ئیزنی ژن بێت.

**١٢٥) قَالَ رسول اللهِﷺ: ((الْخِتَانُ سُنَّةٌ لِلرِجَالِ، وَمَكْرَمَةٌ لِلنِساءِ))**رواه الطبراني بسند جيد.

**واتە:** خەتەنەکردن بۆ پیاوان سوننەتەو بۆ ئافرەتانیش ڕێزدانە.

**١٢٦) عَنْ عَلِيٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنْتُ قَاعِداً عِنْدَ رَسُولِ اللهِﷺ عِنْدَ البَقِيعِ فِي يَوْمَ مطر، فَمَرَّتَ إمْرَأَةٌ عَلَى حِمَارٍ فَهَوَتْ يَد**

الْحِمَارِ فِي وَهْدَةٍ فَسَقَطَتْ الْمَرْأَةُ فَأَعْرَضَ عَنْهَا النَّبِيُّ ﷺ بِوَجْهِهِ، فَقَالُوا: يَارَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا مُتَسَرْوِلَةٌ، فَقَالَ: اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُتَسَرْوِلاَتِ مِنْ أُمَّتِي، يَا أَيُّهَا النَّاسُ، اِتَّخِذُوا السَّرَاوِيلاتِ فَإِنَّهَا مِنْ أَسْتَرَ ثِيَابِكُمْ، وَحَصِّنُوا بِهَا نِسَاءَكُمْ إِذَا خَرَجْنَ)) رواه ابن عدي والعقيلي والبزار والبيهقي باسناد جيد.

**واته:** ئیمامی عەلی ڕەزای خودای لەسەر بێ، فەرموویەتی: لەلای پێغەمبەری خوا دانیشتبووم لە بقیع لە ڕۆژێکی باراناویدا، ئافرەتێك لەسەر گوێدرێژێك دا کەوتە ناو کەندێکی ئاوەوە، جا ئافرەتەکە کەوتە خوارەوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی وەرگێڕا، ئەوانەی لەوێ بوون گوتیان: ئەی پیاەمبەری خوا ﷺ، ئەم ئافرەتە بێجامەی لەبەرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە لەگوناهی ئافرەتە بێجامەلەبەرەکانی ئوممەتم خۆش بە، ئەی خەڵکینە، بێجامە بپۆشن، چونکە داپۆشەرترین پۆشاکتانە، با ئافرەتەکانتان لەبەری بکەن گەر لە ماڵەوە چوونە دەرەوە. (جا هەر ئافرەتێك دەیەوێ وەبەر دوعاکەی پێغەمبەر ﷺ بکەوێ با لەژێر جلەکەیەوە بێجامە لەبەر بکات).

١٢٧) عَنْ أَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه قَالَتْ: جَاءَ اِمْرَأَةٌ اِلى النَّبِي ﷺ وَقَالَتْ: أَرَأَيتَ إِحدانا إِذَا أَصَابَ ثَوْبُهَا الدَّمَ مِنَ الْحَيْضِ كَيْفَ تَصْنَعُ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَحتُّهُ، ثُمَّ تَقرِصُهُ

بِالْمَاءِ ثُمَّ تَنْضَحَهُ ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ))رواه البخاري وابوداود.

**واتـه**: ئـەسماى كـچى ئەبوبـەكر ڕەزاى خوايـان لىٚبـىٚ، وتوويـەتى: ئافرەتێك هاتە لاى پێغەمبـەرﷺ ووتـى: گـەر يـەكێك لەئێمـە پۆشاكەكەى بەخوێنى حـەيزەوە بـوو، چـى بكـات؟ پێغەمبـەرى خواﷺ فەرمووى: بەيەكەوەى دەخشێنێ پاشان بـە ئـاو شـوێنى خوێنەكە بە پەنجە پێدا دێنێ بۆ ئەوەى خوێنەكە لابچێت، پاشـان ئاوى پێدادەكەى و نوێژى پێ دەكەيت.

١٢٨) قَالَتْ عَائِشَةَ ﵂: لَقَدْ كُنْتُ أَغْسِلُ أَنَا وَرُسُولُ اللهِﷺ مِنْ إِنَـاءٍ وَاحِـدٍ، وَلاَ أَزِيـدُ أَنْ أُفـرِّغَ عَلَـى رَأْسِـي ثَـلاَثَ إِفْرَاغاتٍ))رواه مسلم.

**واتـه**: من و پێغەمبەرى خواﷺ لە يەك مەنجەڵ ئاودا خۆمان شتووە و لەسێ جار زياتر ئاوم بەخۆدا نەكردووە.

١٢٩) عَنْ عَائِشَةَ﵂ قَالَتْ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيُـصَلِي وَأَنَـا لَمُعْتَرِضَةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ اِعْتِراضَ الْجَنَّازَةِ، حَتَى إِذَا أَرَادَ أَنْ يُـوُتِرَ مَسَنِي بِرِجْلِهِ))رواه النسائي وأحمد.

**واتـه**: خاتوو عائشە فەرموويـەتى: پێغەمبـەرﷺ نوێـژى دەكـرد و منـيش لەبـەردەمى ڕاكـشابووم وەك ڕاكـشانى جـەنازە، گـەر بيويستايە نوێژى وتر بكات قاچى لە قاچم دەدا.

١٣٠) عن أنس بن مالك﵁ قال: ((وُقِتَ لَنَا فِي قَصِّ الـشَّوَارِبِ

وَتَقْلِيمِ الأَظَافِرِ وَنَتْفِ الإِبطِ وَحَلْقِ الْعَانَةِ أَنْ لاَ تَتْرُكَ أَكثرَ مِنْ اَرْبَعِينَ لَيْلَةً))رواه مسلم.

**واته:** پێغەمبەرﷺ کاتی بۆ دانایین کە لە چل ڕۆژ زیاتر نەهێڵین سمێڵ و نینۆکمان درێژ بێت و مووی بن هەنگڵ و مووی بەرمان درێژ بێت، بەواتای بیانکەین (جا ئەمە جگە لە سمێڵ کورت کردنەوە، تایبەتە بە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ، واتە ئافرەت و پیاو).

**١٣١)** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ جَاءَتْ إِلى النَّبِي ﷺ وَقَالَتْ: إِنِّي اِمْرَأَةٌ أَسْتَحاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدْعُ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَ لَهَا: لاَ، إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ وَلَيْس بِالْحَيْضَةِ، إجْتَنِبِي الصَلاَةَ أَيَّامَ مَحِيضَكِ، ثُمَّ اِغْتَسِلِي، وَتَوَضَأِي لِكُلِ صَلاَةٍ، ثُمَّ صَلِّي، وَإِنْ قَطَرَ الدَّمَ عَلَى الْحَصِيرِ)) رواه ابن ماجه بسند صحيح.

**واته:** خاتوو عائیشە ڕەزای خوای لەسەر بێ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فاتیمەی کچی حوبەیش هاتە لای پێغەمبەرﷺ و گوتی: من تووشی خوێن چرکە(استحاچە) بوومە پاك نابمەوە، ئایا نوێژ بکەم؟ پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: بەڵێ، نوێژ بکە، چونکە ئەم خوێنە خوێنی دەمارە نەك خوێنی حەیز، لەکاتێ کە لە حەیزدا بیت لە نوێژەکان دوور کەوەو مەیکە، پاشان کە پاك بوویتەوە

خۆت بشۆ، جا كه خوێن دوای حەیزەكه هات، بـۆ هـەر نوێـژێك دەستنوێژ هەڵگرەو پاشان نوێژ بكه، با لەكاتی نوێژەكەش خـوێن بێتەدەر و بكەوێتە سەر حەسیری نوێژەكه (یا بەرماڵی نوێژ).

**١٣٢) قال رسول الله ﷺ : ((لاَ تُؤَمَّمُ إِمْرَأَةٌ رَجُـلاً))** رواه ابن ماجه بسند صحيح.

**واتـه:** ئافرەت بۆی جائیز نییه ببێتـه ئیمـام بـۆ مێردەكـەی (بـەڵام ئەگەر ئافرەتەكه شـارەزاتر و زانـاتر بـوو لـه مێردەكـەی، ئـەوه دروسته ببێته ئیمام بـۆ مێردەكـەی، چـونكه پێغەمبـەرﷺ (ام ورقه كچی نوفل)ی ڕاسپارد و فەرمانی پێكرد كه ببێتـه ئیمـام بۆ مێردەكەی. (المفصل في أحكام المرأة/ ج١ ص٢٥٢.)

**١٣٣) قال رسـول اللهﷺ : ((إِذَا دَعَـا الرَّجُـلُ إِمْرَأَتَـهُ فَأَبَـتَ أَنْ تَجِيَء لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحُ))**رواه البخاري.

**واته:** هەركاتێك پیاوێك داوای جووت بوون له خێزانەكـەی بكـات و ئافرەتەكەش قەدەغەی بكات له جووت بـوون، ئـەوا تـا بـەیانی دەكاتەوه فریشتەكان لەعنەتی(نەفرین) لیّ دەكەن.

**١٣٤) قال رسول اللهﷺ : ((مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ أَلْبَسَهُ اللهُ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ ثَوْباً مِثْلَهُ ، ثُمَّ يَلْهَبُ فِيهِ النَّـارَ))** رواه أبوداود وابـن ماجـة ، صحيح الجامع ٢٥٢٦.

**واته:** هەر كەسێك جل و بەرگێك لەبـەر بكـات بـۆ ئـەوەی پێیـەوه

بەرچاو بێت و نازو فیزی پێ لێ بدات، ئەوا خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دوایی‌دا، بەرگێکی وەك ئەوی لەبەر دەکات و دوایش گڵپە دەگرێت و گڕی لێ هەڵدەستێت لەناو ئاگردا (ئەمە ئاگاداری ئەو ئافرەتانە دەکاتەوە کەوا زۆر جۆری حیجاب لەبەر دەکەت تا تکبر بەسەر خوشکانیان لێ بدەن).

**١٣٥) قال رسول الله ﷺ : ((لاَ تَتبِعُ النَّظْرَةَ النَظْرَةَ فإنَّ لَكَ الأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الأُخْرَى))** صحيح رواه الترمذي رقم ٢٢٢٩.

**واتە:** تەماشا مەکە بەشوێن یەکدا و دووبارەی مەکەرەوە، یەکەمجار قەیناکا، بەڵام دووەم جار بۆت نییە و بە گوناه بۆت دەنوسرێت.

**١٣٦) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسول الله ﷺ لا يتوضأ بعد الغسل.** صححه الألباني.

**واتە:** پێغەمبەرﷺ لەدوای خۆشووشتن دا دەستنوێژی هەڵنەدەگرت.

**١٣٧) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((إذا صَلَّتِ الْمَرأَةُ خَمْسَهَا وَصَامَتْ شَهْرَهَا وَحَفَظَتْ فَرْجَهَا وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا دَخَلَتِ الْجَنَّةِ))** رواه الطبراني بسند جيد.

**واتە:** ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژە فەرزەکەی بەتەواوی جێبەجێ کرد و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو و، داوێنی پاراست و گوێڕایەڵی مێردەکەی کرد، پێی دەوترێت لەکام دەرگای بەهەشتەوە ئارەزووت هەیە بڕۆ بۆ ژوورەوە.

---



١٣٨) قَالَ رَسولُ اللهِﷺ: ((إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا نَظَرَ إِلَى اِمْرَأَتِهِ وَنَظَرَتْ إِلَيْهِ نَظَرَ اللهُ إِلَيْهَا نَظْرَ الرَّحْمَةِ، فَإِذَا أَخَذَ بِكَفِهَا تَسَاقَطَتْ ذُنُوبُهَا مِنْ خِلاَلِ أَصَابِعِهَا))رواه السيوطي وصححه.

**واته**: بەڕاستی کاتێک پیاو سەیری ئافرەتەکەی دەکا بەسۆز و خۆشەویستی و ئافرەتەکەش بە هەمان شێوە سەیری پیاوەکەی بکاتەوە (واتە یارمەتی دانی یەکتر و جوانترین شێوەی قسە هەڵبژاردن و بانگی یەکتر کردن بەڕێز و خۆشەویستی دەبێتە هۆی بەهێزکردنی ئارامگاکە)، ئەوا گوناهەکانیان لەنێوان پەنجەکانیانەوە هەڵدەوەرێت.

١٣٩) قال رسول اللهﷺ: ((دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَعْظَمُهَا أَجْراً الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلِى أَهْلِكَ))رواه مسلم عن ابي هريرةرضي الله عنه.

**واته**: ئەو دینارەی لەڕێی خوادا بەخشیوتەو، ئەو دینارەی لەئازادکردنی بەندەیەك خەرجت کردووەو، ئەو دینارەی بەخێر داوتە بە هەژارێك و، ئەو دینارەی بۆ خێزانت خەرجت کردووە، لە هەموویان پاداشتی زیاتر ئەوەیە کە بۆ خێزانت خەرج کردووە.

١٤٠) قال رسول اللهﷺ: ((إِنَّ مِنْ أَكْمَلِ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَاناً أَحْسَنُهُم خُلُقاً وَأَلْطَفُهُمْ بِأَهْلِهِ)) رواه الترمذي والنسائي بسند جيد.

**واته**: تێروتەواوترین باوەڕدار ئەوەیانە کە لە هەموویان زیاتر ڕەوشتی جوانترەو لە هەموویان زیاتر لەگەڵ خێزانیدا نەرمە.

**١٤١) قال رسول اللهﷺ: ((رَحِمَ اللهُ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيلِ فَصَلَّى وَأَيْقَظَ اِمْرَأَتَهُ فَصَلَّتْ فَإِنْ أَبَتَ نَضحَ فِي وجهها الماء، رحم الله امرأة قامت من الليل فصلت وأيقظت زوجها فإن أبى نضحت في وجهه الْمَاءَ))** رواه أحمد والنسائي وابوداود باسناد صحيح.

**واته**: ڕەحمەتی خوا لەو پیاوە بێ کە شەو هەڵدەستێ نوێژ دەکات و خێزانەکەیشی بەخەبەر دێنێ و ئەویش نوێژ دەکات، ئەگەر هەڵنەدەستا ئەوا ئاو بپرژێنێت بە دەم و چاویدا (واتە زۆر بە نەرمی نەبێتە هۆی ئاژاوە)، ڕەحمەتی خوا لەو ئافرەتەی بێ کە شەو هەڵدەستێ و نوێژ دەکا و مێردەکەی بەخەبەر دێنێ ئەویش نوێژ دەکات، ئەگەر هەڵنەدەستا ئاو بپرژێنێ بە دەم و چاویدا.

**١٤٢) قال رسول اللهﷺ: ((إِذَا تَزَوَجَ الْعَبْدُ فَقَدْ اِسْتَكْمَلَ نِصْفَ دِينِهِ، فَلْيَتَقِ اللهِ فِي النِّصِفِ الآخَرَ))** رواه البيهقي بسند حسن.

**واته**: گەر بەندەی خوا ژن بهێنێ یان شوو بکات، ئەوا نیوەی ئیمان و دینەکەی تەواو کردووە، با بۆ نیوەکەی تر کە ماویەتی لەخوا بترسێ و خۆی پارێزکات لە گوناه و تاوان.

**١٤٣) قال رسول اللهﷺ: ((إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمْ اِمْرَأَةً فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَنْظُرَ إِلَيْهَا إِذَا كَانَ، إِنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا لِخِطْبَتِهِ، وَإِنْ**

كَائَتْ لاَ تَعْلَم)) رواه الطحاوي وأحمد بسند صحيح.

**واته**: گەر یەكێك لەئێوە ئافرەتێكی داخوازی كرد، گوناهی ناگا گەر تەماشای ئەو ئافرەتە بكات، چونكە تەماشاكردنەكەی بۆ داخوازیە، جا كچەكەش پێی نەزانی و ئاگای لیٚ نەبیٚ.

١٤٤) قال رسول الله ﷺ: ((إِذَا أَلْقَى اللهُ فِي قَلْبِ اِمْرِئٍ خِطْبَةَ اِمْرَأَةٍ فَلاَ بَأسَ أَنْ يَنظُرَ إِلَيْهَا)) رواه ابن ماجه والطحاوي وأحمد باسناد صحيح

**واتە**: ئەگەر ئافرەتێك كەوتە دڵی پیاوێك بۆ داخوازی كردنی، چی تیا نیە ئەگەر تەماشای بكات.

١٤٥) قال رسول الله ﷺ: ((إِنَّ مِنْ يُمْنِ الْمَرْأَةِ تَيْسِيرُ خِطْبَتِهَا وَتَيْسِيرُ صِدَاقِهَا وَتَيْسِيرِ رَحْمِهَا)) رواه أحمد والنسائي باسناد حسن.

**واتە**: لەخێر و بەرەكەتی ئافرەت ئەوەیە كە خوازبێنییەكەی ئاسان بكریٚ و مارەییەكەی سوك و ئاسان بیٚ و زۆر نەبیٚ.

١٤٦) قال رسول الله ﷺ: ((أَلاَ لاَ تَغَالُوا صدقة النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرَمَةٌ فِي الدُّنيَا أَوْ تقوى عِنْدَ اللهِ لَكَانَ أَوْلاَكُمْ بِهَا نَبِيُّ اللهِ ﷺ! مَا عَلِمْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ نكح شَيْئاً مِنْ نِسَائِهِ وَلاَ أَنْكَحَ شَيْئاً مِنْ بَنَاتِهِ عَلَى أَكْثَرِ مِنْ ثِنْتَيْ عَشَرَةَ أَوْقِيَةً))
رواه احمد والترمذي والنسائي باسناد صحيح.

**واتە**: نەكەن مارەیی ئافرەتان زۆر بكەن!! چونكە گەر لە دونیادا

مارەیی زۆر جێگەی ڕێــز و چــاکی و تــەقوای خــوا بوایــە، ئــەوا پێغەمبەرﷺ لە هەموانتان شایستەتر بوو بۆ زۆردانی مــارەیی، پێغەمبەرﷺ بۆ مارەیی خێزانــەکانی لــە دوازدە ئۆقیــە زیــاتری نەداوە، هەروەها بۆ کچەکانیشی بەهەمان شێوە.

(ئەو چیرۆکەی باسی ژنەکە دەکات وەڵامی ئیمامی عومەری دایــەوە بە ئایەتی (وآتيتم إحداهن قنطاراً) کە ئیمامی عومەر داوای کرد مارەیی ژن زۆر داوا نەکرێ، ڕاست نیيە لە دوو لایەن:

١-گێڕانەوەکە پچڕانی تێدایە.

٢-هەندێکی تریش لاواز(ضـعيف)ن بەهۆی مجالدی کوڕی سـعید یــان قەیسی کوڕی ڕەبیع، هەردوکیشیان ابن حجـر العـسقلانی بــە زەعیفی داناون.

١٤٧) قــال رســول اللهﷺ: ((أَحَـقُ الـشُرُوطِ أَنْ تُوَفـوْا بِــهِ مَــا إِسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ مِنَ الفُرُوجِ)) رواه البخاري ومسلم.

**واتــە:** مەرج ترین مەرج کە وەفای بکرێ ئەوەیە کە بەهۆیەوە داوێنی هاوسەری پێ حەڵاڵ کراوە.

١٤٨) قــال رســول اللهﷺ: ((فَـصْلُ مَــا بَـيْنَ الحَـلاَلِ وَالْحَـرَامِ اَلصَّوْتُ وَالدَّفُ)) رواه النسائي والترمذي وابن ماجه باسناد صحيح.

**واتــە:** جیاوازی نێوان نیکاحی حەڵاڵ و حــەرام ئاشـکراکردنیەتی لــە دەف و گۆرانی.

١٤٩) لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ اَلْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالنَّامِصَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقِ اللهِ)) رواه البخاري ومسلم.

**واته**: پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی لەو ئافرەتانە کردووە کە دەست و چەناگە و سەری لوتیان بەدەرزی دەکوتن، نەفرەتەکەش هەردوو کەس دەگرێتەوە ئەوەی داوای دەکات و ئەوەیش کە وەك پیشە بەکاری دێنێ، وە نەفرەت لەو کەسانەش بێ کە برۆ باریك دەکەنەوە (مەگەر ئەوەی شووی کردبێ بۆ مێردەکەی باریکی بکاتەوە کە لە پێشەوە باسمان کرد)، وە ئەوانەی برۆیان بۆ باریك دەکرێتەوە، هەروەها نەفرەتی لەو کەسانە کردووە کە کەلێن و بۆشایی لە ددانەکانیان دروست دەکەن بۆ جوانی کە ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی دروستکراوی خوا.

١٥٠) قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((طَيِّبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخُفِيَ لَوْنُهُ، وَطَيِّبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ)) رواه الترمذي والنسائي بسند صحيح.

**واته**: بۆنی پیاوان ئەوەیە کە بۆن بکرێ و ڕەنگەکەی بشاردرێتەوە، بۆنخۆشی ئافرەتانیش ئەوەیە کە ڕەنگەکەی بەدەر بکەوێ و بۆنی نەکرێ.

١٥١) قال رسول الله ﷺ: ((إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمْ اِمْرَأَةً فَلْيَأْخُذْ

بِنَاصِيَتِهَا (أيْ بِمَقْدَمَ رَأْسِهَا) وَيسْمُ اللهَ عِزَّ وَجَّلَ وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ وَلْيَقُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا وَخَيْرِ مَا جِبلَتِهَا عَلَيْهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِهَا وَشَرِ مَا جِبلَتِهَا عَلَيْهِ)) رواه ابوداود بسند حسن.

**واته**: گەر کەسێك لەئێوە ژنی هێناو گواستیەوە، با پێشەوەی سەری (نێوچاوان)ی بگرێ و ناوی خوا بهێنێ و بڵێ (بسم الله) و با دوعای خێر و بەرەکەتی بۆ بکات و بڵێ: خوایە من داوای خێر و خۆشی ئەو ژن هێنانەت لێ دەکەم و داوای چاکە و خێری خورەوشت و رەفتاری ئەو ئافرەتەت لێ دەکەم. خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپەی ئەو ئافرەتەو خراپی خورەوشت و رەفتاری.

١٥٢) قال رسول الله ﷺ: ((لاَ يَفْرَكُ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً! إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقاً رَضِيَ مِنْهَا الآخَرُ.)) رواه مسلم وغيره.

**واته**: پیاوی بڕوادار با ڕق و کینەی بەرامبەر بە ئافرەتی بڕوادار نەبێت! گەر لە ڕەوشتێکی ناڕازی بێ و شتێکی پێ ناخۆش بێ، ئەوە ڕەوشتێکی تری بەدڵەو ڕازی دەکات.

١٥٣) أَوْلَمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذْ بَنِيَ بِزَيْنَبَ فَأَشْبَعَ الْمُسْلِمِينَ خُبْزاً وَلَحْماً، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِنَّ وَدَعَا لَهُنَّ وَسَلَمْنَ عَلَيْهِ وَدَعَوْنَ لَهُ، فَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ صبيحت **بنائه**))صحيح رواه النسائي.

**واته**: لەو کاتەی پێغەمبەرﷺ زەینەبی گواستەوە، دەعوەتی موسڵمانانی کرد، کە چێشتەکە نان و گۆشت بوو، جا موسڵمانانی تێر نان و گۆشت کرد، کە بەیانی داهات چووە لای خێزانەکانی تری و سەلامی لێ کردن و دوعای بۆ کردن، ئەوانیش سەلامیان لێ کرد و دوعای بەخێریان بۆ کرد.

١٥٤) قال رسول اللهﷺ: ((غُسْلُ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَالسِّوَاكُ وَأَنْ يَمَسَّ الطِّيبَ مَا يَقْدِرُ عَلَيْهِ)) رواه البخاري ومسلم.

**واته**: خۆشتن لە ڕۆژی هەینی لەسەر هەموو کەسێك کە باڵغ بووبی و ئیحتلامی بووبێ پێویستە، هەروەها سیواك کردن و بۆن خۆش کردن بەگوێرەی توانا.

١٥٥) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((إِنَّ النَّبِيَّﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ وَيَمُصُّ لِسَانَهَا)) رواه احمد وابوداود والبيهقي باسناد حسن.

**واته**: پێغەمبەری خواﷺ بەڕۆژوو بووەو خاتوو عائیشەی ماچ کردووەو زمانی مژتووە.

١٥٦) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، تَخْتَلِفُ أَيْدِينَا عَلَيْهِ! فَيُبَادِرُنِي حَتَى أَقُولُ دَعْ لِي دَعْ لِي قَالَتْ وَهُمَا جُنُبَانِ)) رواه الجماعة إلا البخاري.

واتە: من و پێغەمبەرﷺ لەشمان گران بووین و پێکەوە خۆمان



دەشوشت لەیەك مەنجەڵ دا، جا هەردووكمان دەستمان ئەبرد بۆ ئاوەكەو پێغەمبەرﷺ زوتر و لەپێش من دەستی بۆ ئاوەكە دەبرد بۆ ئەوەی ئاوەكە بەخۆیدا بكات و منیش پێم ئەوت بۆ منیش لێ گەڕێ بۆ منیش لێ گەڕێ، تا ئاوەكە بەخۆم دابكەم.

١٥٧) عَنِ الْحَسَنِ أَنَّ عُقَيْلَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه ، أَنَّهُ تَزَوَّجَ اِمْرَأَةً، فَدَخَلَ عَلَيْهِ الْقَوْمَ فَقَالوا: بِالرِفَاءِ وَالْبَنِين، فَقَالَ: لاَ تَفْعَلُوا ذَلِكَ! فَإِنَّ رَسُولَ اللهِﷺ نَهَى عَنْ ذَلِكَ.)) رواه النسائي وغيره باسناد صحيح.

**واتە**: لە حەسەنی كوڕی عقیلی كوڕی ئەبوتالیبەوە، كەوا ژنێكی مارەبڕ كردووە، جا قەومەكە هاتوونەتە لای و گوتوویانە: بەهیوای بەیەكەوە گونجان و نانەوەی كوڕ (واتە خودا كوڕت بداتێ)، ئەویش گوتی: ئەوە مەڵێن، چونكە پێغەمبەری خوا نەهی لەمە كردووە.

١٥٨) عَنْ أَمِ كَلْثُوم بِنَتِ عُقْبَةَ قَالَتْ: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَخَصَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْكَذِب إلاَّ فِي ثَلاَثٍ: الرَّجُلُ يَقُولُ الْقَوْلَ يُرِيدُ بِهِ الإِصْلاَحِ، وَالرَّجُلُ يَقُولُ الْقَوْلَ فِي الْحَرْبِ، وَالرَّجُلُ يُحَدِّثُ اِمْرَأَتَهُ وَالْمَرْأَةُ تَحَدِّثُ زَوْجَهَا)) رواه مسلم.

**واتە**: گوێم لە پێغەمبەری خوا نەبووە لە هیچ شتێك ڕێگە بە درۆ



بدات ئەگەر لە سێ کـات نـەبێ: پیـاو قـسەیەك دەکـات بـە مەبەستی ئیصلاحی نێوان دوو کەس، لەکاتی جەنگدا، کاتـێ پیاو قسەیەك بۆ خێزانەکـەی دەکـات و، ژنـیش قـسەیەك بـۆ مێردەکەی دەکات.

١٥٩) قال رسـول اللهﷺ: ((إِنـي لاَ أُصَـافِحُ النِّـساءَ)) رواه احمد في المسند بسند صحيح.

**واتە:** من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم.

١٦٠) قـال رسـول اللهﷺ: ((وَلاَ تَغْشَـشْنَ أَزْوَاجَكُـنَّ))، فَقَـالَ اِمْرَأَةٌ: مَا غَشُ أَزْوَاجِنَـا؟ فَقَـالَ: ((تَأْخُـذُ مَالَـهُ فتحـابي بـه غيره)) رواه أحمد بسند صحيح.

**واتە:** فێڵ لە پیاوەکانتـان مەکـەن، ئافرەتێـك فـەرمووی: فـێڵ لـە مێردەکانمان ناکەین، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ماڵەکـەی دەبـەی یەکێکی ترت خۆش دەوێت.

١٦١) قال رسول اللهﷺ: ((أَلاَ أُخبِرُكُمْ بِخَيْرِ نِسَائِكُمْ فِي الْجَنَّةِ؟ قُلْنَا: بَلى يَا رَسُولُ اللهِ، قَالَ: كُـلُّ وُدُودٍ وُلُـودٍ، إِذَا غَـضِبَ زَوْجُهَا قَالَتْ: هَذِهِ يَدْي فِي يَدِكَ، لاَ اَكْتَحِـلُ بِغَمْـضٍ حَتَّـى تَرْضَىَ)) رواه الطبراني (حديث صحيح)

**واتە:** پێتـان ڕابگەیـەنم باشـترین ئافرەتتـان لـە بەهەشـتدا کێیـە؟ گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: هەمو ئـافرەتێکی

---

که مەحبوب بێت و منداڵی ببێت، گەر مێردەکەی تورە بوو بڵێ: ئەوە دەستم لە دەستتدایە، کل لە چاوم ناکەم بە نوقـاوی (واتـە ناخەوم) هەتا وەکو ڕازی نەبیت.

١٦٢) قال رسول اللهﷺ: ((مَـا اَسْـتَفَادَ الْمُـؤْمِنُ بَعْـدَ تَقْـوَى اللهِ خَيْراً لَهُ مِنْ زَوْجَةٍ صَالِحَةٍ إِنْ أَمَرَهَا أَطَاعَتْـهُ وَإِن نَظَـرَ إِلَيْهَـا سَرَّتْهُ وَإِنْ أَقْـسَمَ عَلَيْهَـا أَبَرَّتْـهُ وَإِنْ غَـابَ عَنْهَـا حفظتـه في نفسها وماله)) رواه البخاري.

**واتە:** مرۆڤـی بـڕوادار لـەپاش ترسـان لـەخوا، هـیچ خێرێکـی وەك هاوسـەرێکی چـاك بەدەسـت نـەهێناوە، گـەر فـەرمانی پێکـرد گوێڕایەڵی دەکـات، گـەر تەماشـای کـرد دڵـی خـۆش دەکـات، وەکاتێ سوێندنی لێ خوارد لە سوێند خواردندا نەیخات

١٦٣) قـال رسـول اللهﷺ: ((عَلَـيْكُمْ بِـشَوَائبِ النِّـسَاءِ، فَـإِنَّهُنَّ أَطْيَبُ اَفْوَاهَا وَأَنْتَفُ أَرْحَامـاً وَاَسْـخَنُ إِقْبَـالاً)) رواه الشيرازي في الألقاب وصححه الألباني في صحيح الجامع الصغير.

**واتە:** ئافرەتانی گەنج بکەنە هاوسەری خۆتان، چونکە زمان شیرین و منداڵیان زۆر دەبێ و بەگەرمی دێنە پێشوازی.

١٦٤) قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: ((لاَ يَنظُرُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَـالَى إِلَـى إِمْـرَأَةٍ لاَ تَشْكُر لِزَوْجِهَا وَهِيَ لاَ تَسْتُغْنِي عَنْهُ)) رواه النسائي والبزار بسند جيد.

**واتە:** خوای پەروەردگار تەماشای ئـەو ئافرەتـە ناکـا کـە سوپاسـی



پیاوەکەی خۆی نەکات.

١٦٥) قِيلَ يَا رَسُول اللهﷺ، مَا شَؤْمُ المَرْأَةِ؟ قَالَ: عُقْمُ رَحْمِهَا وَسُوءُ خُلقِها.)) رواه الطبراني بسند حسن.

**واتە:** پرسیار کرا لە پێغەمبەرﷺ: شومی و نەگبەتی ئافرەت چیيە؟ فەرمووی: ئافرەتەکە مندالّی نەبێ و کرداری خراپ بێ و بەخراپی ڕەفتار بکا.

١٦٦) قال رسول اللهﷺ: ((أيّما اِمْرَأةٍ سَأَلَتَ زَوْجَهَا الطَّلاَقَ فِي غَيْرِ مَا بَأس فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ)) رواه احمد والترمذي باسناد صحيح.

**واتە:** هەر ئافرەتێك داوای تەلاّق لەمێردەکەی بکات بەبێ هیچ هۆیەکی حەقدار، ئەوا بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە (واتە ناچێتە بەهەشت).

١٦٧) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ تُؤْذِي اِمْرَأَةٌ زَوْجَها في الدُّنْيَا، إلاّ قَالَتْ زَوْجَتَهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ: لاَ تُؤْذِيهِ قَاتَلَكَ اللهُ! فَإنَّمَا هُوَ عِنْدَكَ دَخِيلٌ يُوشَكٌ أنْ يُفَارِقَكِ إلَيْنَا)) حديث حسن رواه الترمذي.

**واتە:** لەو کاتەی ژن ئازاری مێردەکەی دەدات لەدنیادا، ئەوا حۆری بەهەشت کە بۆ ئەو پیاوە دانراوە و هاوسەریەتی دەڵێ: خوا بتکوژێ! ئازاری نەدەی! ئەم پیاوە لای تۆ میوانەو هێندەی نەماوە لای تۆ بەجێ بهێڵێ و بێتە لای ئێمە.

١٦٨) قال رسول اللهﷺ: ((مَنِ اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَصَلَّيَا رِكْعَتَيْنِ جَمِيعاً كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ)) رواه ابوداود والنسائي والبيهقي (حديث حسن).

**واته:** گەر پیاو بەشەو ژنەکەی لەخەو هەڵبستێنێ و هەردوکیان پێکەوە دوو ڕکات نوێژیان کرد، ئەوا ئەو شەوە لەو کەسانە دادەنرێن کە یادی خوا زۆر دەکەن.

١٦٩) قالَ رَسُولُ اللهِﷺ: ((يَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي رِجَالٌ يَرْكَبُونَ عَلَى السُرُوجِ كَأَشْبَاهِ الرِّجَالَ يَنْزِلُونَ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسَاجِدِ، نِسَاؤُهُمْ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ عَلَى رُءوُسِهِنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ العجاف، اِلْعَنُوهُنَّ فَإِنَّهُنَّ مَلْعُونَاتٌ)) رواه أحمد وابن حبان والحاكم (حديث صحيح).

**واته:** لە کۆتایی ئوممەتەکەم پیاوانێک پەیدا دەبن سواری جۆرە سواریەك دەبن (واتە ئۆتۆمبێل) کە لەبەر دەرگای مزگەوتەکان دادەبەزن، ئافرەتەکانیشیان پۆشتەن و ڕوتیشن، قژیان تۆپەڵە دەکەن وەك بەرزایی پشتی حوشتری لاواز، ئێوە لەعنەت لەو ئافرەتانە بکەن، چونکە ئەوانە بەر لەعنەت کەوتوون.

١٧٠) قال رسول اللهﷺ: ((نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءَ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ)) رواه البخاري.

**واته:** باشترین ئافرەت ئافرەتە ئەنصاریەکانن، شەرم کردنیان نەبۆتە

هۆی ئەوەی لە ئایین شارەزا نەبن.

١٧١) قَالَتْ هِنْدُ اِمْرَأَةُ أَبِي سُفْيانَ: يَا رَسُولُ اللهِ، إنَّ أَبا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ وَلَيْسَ يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي إلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْهُ وَهُوَ لاَ يَعْلَمُ. فَقَالَ: ((خُذِي ما يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ)) رواه البخاري وغيره.

**واتە**: هندی خێزانی ئەبوسوفیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەبوسوفیان پیاوێکی ڕەزیلە و ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی خۆم و منداڵەکەم بکات، تەنها ئەوە نەبێ بۆ مەسرەفی ماڵەوە بەبێ ئاگاداری ئەو پارەی لێ دەبەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەندەی بەشی خۆت و منداڵەکەت دەکات پارەی لێ ببە، بەڵام بەپێی پێویست بێ و بۆ مەسرەفی ماڵەوە بێ، واتە: زیادە ڕەوی تێدا نەبێ لە بردنی پارە بۆ شتی بێ سوودو بێ کەڵك.

١٧٢) إنَّ اِمْرَأَةً كَانَتْ تَخْتِنُ النِّسَاءَ فِي الْمَدِينَةِ، فَقالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَنْهَكِي!! فَإنَّ ذَلِكَ أَحْظَى لِلْمَرْأَةِ وَأَحَبُّ لِلْبَعْلِ)) رواه ابوداود وسنده صحيح.

**واتە**: لەشاری مەدینەدا ئافرەتێك هەبوو خەتەنەی ئافرەتانی دەکرد، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: لە خەتەنەکردندا ئاگادار بە زۆری مەبڕە، چونکە (بڤر) باشترین خۆشی و چێژ وەرگری ئافرەتەو، بۆ پیاویش (واتە مێرد) خۆشتر و باشترە.

بظر: ئـەو پارچـە گۆشـتـەیە کـە بـە سـەرووی نـاوەوەی فـەرجی
ئافرەتەوەیە، ئەرکی بریتی‌یە لە خۆشی و چێژ وەرگرتن لـەلای
ئافرەت.

١٧٣) قال رسول الله ﷺ: ((مَـا تَرَكْـتُ بَعْـدِي فِتْنَـةً أَضَـرُّ عَلَـى الرِّجَالِ مِنَ النِّساءِ)) رواه البخاري ومسلم.

**واتە:** لەدوای خۆم هیچ تاقیکردنەوەیەك وەك تاقیکردنەوەی ئافرەتان
بۆ سەر پیاوانم بەجێ نەهێشتووە، کە ئاوا کاریگەر بێ.

١٧٤) قال رسول الله ﷺ: ((لَوْ لاَ حَـوَاءُ ، لَـمْ تَخُـنْ أُنْثَـى عَلَـى زَوْجِهَا الدَّهْرَ)) رواه مسلم.

**واتە:** گەر دایکە حەوا نەبووایـە، بەدرێـژی ڕۆژگـار هـیچ ئافرەتێـك
خیانەتی لە مێردەکەی نەدەکرد.

١٧٥) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((أَكْثَرُ مَا يَدْخُلُ النَّاسُ الْجَنَّةَ تَقْوَى اللهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ، وَأَكْثَرُ مَا يَدْخُلُ النَّارَ اَلْفَـمُ وَالْفُـرْجَ)) حديث حسن رواه الترمذي.

**واتە:** ئەوەی کە بەزۆری خەڵك دەباتە نێو بەهەشتەوە لەخواترسـان و
ڕەوشت باشی‌یە، زۆربەی ئەوەش کە خەڵکی دەباتـە نێـو ئـاگری
دۆزەخەوە زمان و داوێنە.

١٧٦) قال رسول الله ﷺ: ((إِثْنَان يَدْخُلاَن الْجَنَّةَ: مَـنْ حَفِـظَ مَـا بَيْنَ لِحْيَيْهِ وَرِجْلَيْهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ.)) حديث صحيح رواه الخرائطي.

---

**واته**: دوو شت هەن دەبنە مایەی چوونە بەهەشت: هەر کەسێ زمان و داوێنی لە گوناه و تاوان بپارێزێ، دەچێتە بەهەشتەوە.

١٧٧) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((لاَ يَحِلُّ لِإمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِالله وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ سَفَراً يَكُوْنُ ثَلاَثَةَ أَيامٍ فَصَاعِداً إِلاَّ وَمَعَهَا أَبُوهَا أَوْ اِبْنِهَا أَوْ زَوْجِهَا أَوْ اَخُوهَا أَوْ ذَوُ مَحْرَمٍ)) رواه البخاري ومسلم.

**واته**: ئافرەتێك كە بڕوای بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی هەیە، بۆی حەڵاڵ نىیە سەفەر بۆ شوێنێك بكات كە ماوەكەی لە سێ ڕۆژ بەرەو سەرەوە زیاتر بێت، مەگەر باوكی یان براكەی یان مێردەكەی یان كوڕەكەی یان مەحرەمێكی لەگەڵدابێ.

١٧٨) قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((إِذَا دَعَا الرَّجُلُ اِمْرَأَتَهُ اِلَى فِرَاشِهِ، فَلْتَجِبْ وَإِنْ كَانَتْ عَلَى ظَهرْ قَتَبٍ)) رواه البزار بسند صحيح.

**واته**: پیاو گەر داوای سەرجێیی لە ژنەكەی كرد بۆ جووت بوون، با ژنەكەی بەدەم داواكاری مێردەكەیەوە بچێ، ئەگەر ئافرەتەكەش لەسەر پشتی حوشتر بوو.

١٧٩) قال رسول اللهِ ﷺ: ((إِذَا دَعا الرَّجُلَ زَوْجَتَهُ لِحَاجِتِهِ فَلْتَأْتِهِ وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُورِ)) حديث صحيح رواه النسائي والترمذي.

واتە: گەر پیاو داوای لە ژنەكەی كرد بۆ جووت بوون، با ژنەكەی بەدەنگیەوە بچێ، ئەگەر ژنەكەی لەسەر تەندوری نان كردن

---

بێ.

١٨٠) قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((ثَلاثَةٌ لاَ تَسْأَلُ عَنهُمْ ..... وَامْرَأَةٌ غَابَ عَنْهَا زَوْجُهَا، قَدْ كَفَاهَا مُؤْنَةُ الدُّنْيَا، فَتَبَرَجَتْ بَعْدَهُ، فَلاَ تَسْأَلُ عَنهُمْ)) رواه احمد في المسند والبخاري في الأدب المفرد وصححه الذهبي.

**واته:** سێ جۆر هەن پرسیار دەربارەیان مەکەن!..... سێیەمیان: ئافرەتێك مێردەکەی پێداویستی دنیای بۆ دابین کردبێ، بەڵام دوای ئەو جوانی و ڕازاوەیی خۆی پیشانی پیاوی بێگانە دابێ، ئەوا لێیان مەپرسن.

١٨١) قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((إِنَّ أَقَلَّ سَاكِنِي الْجَنَّةِ النِّساءُ))مسلم.

واتە: بەڕاستی کەمترین دانیشتوانی بەهەشت ئافرەتەکانن.

١٨٢) قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ((مَا ظَهَرَ فِي قَوْمٍ الزِّنَا وَالرِّبَا إِلاَّ أَحَلُّوا بِأَنفُسِهِمْ عَذَابَ اللهِ)) رواه ابو يعلي بسند حسن.

**واته:** هەر کاتێك داوێن پیسی (زینا) و سووخۆری (ریبا) بە ئاشکرا لەناو هەر میللەتێکدا پەیدا بوو، ئەوا سزای خوای گەورە بەسەریاندا حەڵاڵ دەبێ.

١٨٣) قال رسول اللهِ ﷺ: ((إِذَا ظَهَرَ الزِّنَا ظَهَرَ الْفَقْرَ وَالْمَسْكَنَةَ)) رواه البزار بسند حسن.

**واته:** هەر کاتێك داوێن پیسی بە ئاشکرا ڕوویدا، ئەو هەژاری و نەداری پەیدا دەبێ.

---

١٨٤) قالَ رَسُول اللهِﷺ: ((اَلسَّحَاقُ زِنَـا النِّسَاءِ بَيْـنَهُنَّ)) حديث صحيح رواه البيهقي.

**واته**: ئافرەت بچێتە لای ئافرەت (بەهۆی ماچ کردن و دەست لێـدان لەلاشەی یـەکتری) ئـەوا بـە زینـا لەسـەری حیسابە (واتـە بـۆ هەردووکیان).

١٨٥) قَالَ رَسُـولُ اللهِﷺ: ((اَلسَّاعِي عَلَـى الأَرْمِلَـةِ وَالْمِـسْكِينَ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبيلِ اللهِ)) رواه البخاري ومسلم.

**واتـه**: کەسێك تێبکۆشێ لەپێناو بێوەژنێك، یان کەسـێکی هـەژار و بەخێویان بکات، (مەبەستی تەنها ڕەزامەندی و وەدەست هێنانی خوای پەروەردگار بێت) ئەوا خێری بەقەد ئەو کەسە پـێ دەگـات کە لە ڕێگای خوادا خەبات بکات و جیهاد دەکات.

١٨٦) قال رسول اللهﷺ: ((يَعْمَـدُ أَحَـدُكُمْ إِلَـى إِبْنَتِـهِ فَيُزَوِّجُهَـا اَلْقَبِيحَ الدَّمِيمِ، إِنَّهُمْ يُرِدْنَ مَا تُرِيدُونَ)) رواه عبدالرزاق في المصنف ١٥٢/٦ بسند حسن.

**واته**: ئێوە بە ئەنقەست کچەکانتان مەدەنە یەکێك کە ناشیرین و زەم کراو بێت، چونکە ئافرەتـانیش ئـەو شـتانەی دەوێـت کـە ئێـوە دەتانەوێت (واتە جوانی و ڕێك و پێکی لە جەستە و ڕەوشتدا).

١٨٧) قالَ رَسُول اللهِﷺ: ((لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةَ فِي قَوْمٍ قَطٌّ حَتَّـى يُعْلِنُـوا بِهَا إِلاّ فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونَ وَالأَوْجـاعَ الَّتِـي لَـمْ تَكُـنْ مَـضَت فِـي

أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوا)) رواه ابن ماجه بسند صحيح برقم ٤٠١٩.

**واتـه:** داوێـن پیـسی هـەرکاتێك بەشـێوەیەکی زەق لـەنێو هـەر کۆمەڵگایەکدا بڵاو بۆوە بـەجۆرێك کـە نەیـشارنەوە، ئـەوا بـە تەئکید نەخۆشی و ئەو ئازارانەیان لەناودا بڵاو دەبێتەوە کە لـەو پێشینانەیاندا کە ڕابردوون نەبوون!

١٨٨) عَنْ أَمُ عَطِيَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: اَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَمَرَ يَوْمَ الْعِيد أَنْ تَخْرُجَ الْبِكْرَ مِنْ خِدْرِهَا حَتَّى تَخْرُجَ الْحَيْضَ فَيَكُنَّ خَلْفَ النَّاسِ يُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ وَيَدْعُونَ بِدُعَائِهِمْ يَرْجُونَ بَرَكَةَ هَـذا الْيَوْمِ وَطهره)) رواه البخاري.

**واتـه:** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە کـە ڕۆژی جـەژن کـچی پشت پەردە ببرێتە دەرێ، تەنانەت حەیزدارەکانیش بـچنە دەرێ و لەپـشت خەڵکیـەوە بـن و لەگـەڵ ئەوانـدا (الله اکـبر) بکـەن و لەگەڵیان بپاڕێنـەوەو ئومێـدەواری بەرەکـەت و پـاکی ئـەو ڕۆژە دەبن.

١٨٩) اِنَّ اِمْرَأَةً أُتَتْ النَّبِيَ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولُ اللهِ! إِنَّ اِبْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعاءً وَحَجَرِيَ لَهُ حَوَاءُ وَثَدْيِي لَهُ سَقَاءً، وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي وَأَرَادَ أَنْ يَنتَزِعَهُ مِنِّي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنْـتَ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنكِحِي)) رواه ابوداود بسند صحيح.

**واتـه:** ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەم کوڕەم لـە زگـی خۆمـدا هـەڵم

گرتووه، به مەمكی خۆم تێرم كردووه، له باوەشی خۆمدا حەواندوومەتەوه، ئێستاش بابی تەڵاقی داوم و دەیەوێ ئەم منداڵەم لێ بسەنێتەوه! ئەویش ﷺ فەرمووی: تۆ زیاتر حەقت پێیەوه هەیە مادام شوو نەكەیەوه.

١٩٠) قال رسول اللهﷺ: ((لاَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمْ اِمْرَأَتَهُ جِلْدَ الْعَبْدِ ثُمَّ يُجَامِعُهَا آخِرَ الْيَوْمِ)) رواه البخاري.

**واته**: با یەكێكتان وەك كۆیله به قەمچی له ژنەكەی نەدات پاشان شەو لەگەڵی جووت بێت.

١٩١) قال رسول اللهﷺ: ((... تَصَدَّقْنَ فَإِنَّ أَكْثَرَكُنَّ حَطَبُ جَهَنَّمَ))، فَقَالَتْ اِمْرَأَةٌ مِنْ سِطَةِ النِّسَاءِ، سفعاء الخَدَين، فَقَالَتْ: لِمَ يَا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: ((لأَنَكُنَّ تُكْثِرْنَ المِشْكَاةَ وَتُكَفِرْنَ الْعَشِيرَ..)) رواه مسلم والنسائي والدارمي وابن خزيمة والبيهقي وأحمد.

**واته**: ئەی ئافرەتان خێر و چاكه بكەن، چونكه زۆربەتان سووتەمەنی دۆزەخن! جا ئافرەتێكی ڕوومەت ڕەش هەڵگەڕاو لەنێوەڕاستیانەوه قسەی كرد و گووتی: جا بۆچی ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ ئەویش فەرمووی: چونكه زۆر گلەیی و پرتەو بۆڵه دەكەن، بەرامبەر بەمێردیش سپڵەن.

١٩٢) قال رسول اللهﷺ: ((دِيَّةُ الْمَرْأَةِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ دِيَّةِ



الرَجُلِ)) رواه البيهقي بسند صحيح.

**واته**: تۆڵەی خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە.

١٩٣) عَنْ أَبِي سَعِيدِ الخُدْرِي: قَالَتْ النِساءُ لِلنبي ﷺ: غَلَبَنا عَلَيْكَ الرِّجَالَ، فَاجْعَلْ لَنَا يَوْماً مِنَ نَفْسِكَ.. فَوَعَدَهُنَّ يَوْماً لَقِيهنَّ فيهِ، فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ، فَكَانَ فِيما قَالَ لَهُنَّ: ((مَا مِنكُنَّ اِمْرَأَةً تَقَدَمَ ثَلاثَةً مِنْ وَلَدِهَا إِلاّ كَانَ لَهَا حِجَاباً مِنَ النَّارِ)) فقالت: امرأة واثنتين؟ فقال: ((واثنتين...)) رواه البخاري.

**واته**: چەند ئافرەتێك چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺ ووتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، پیاوان هەموو کاتەکانی جەنابتیان گرتووە، ئێمەش داوات لێ دەکەین کە کاتێکمان بۆ دیاری بکەیت لەلای خۆت.. پێغەمبەری خواشﷺ وەعدەی پێدان و ڕۆژەکەی بۆ دیاری کردن تا لەو ڕۆژەدا بیانبینێت، جا ئامۆژگاری دەکردن و فەرمانی دەدا بەسەریانداو یەکێك لەو ئامۆژگاری و دڵنەوایی‌یانەی کە دەیکردن ئەوەبوو کە دەیفەرموو: هەرکەسێك لەنێوە سێ منداڵی بمرێت و ڕازی بێت بە قەدەری خوا، خوای گەورەش ئەو مردووانە دەکاتە پەردەو ڕێگرێك لەنێوان ئەو دایکە و ئاگردا. ئافرەتێك گوتی: ئەی ئەگەر دووان بوون؟ (واتە دوو منداڵی مردبوو)، فەرموویﷺ: ئەگەر دوانیش بوو.



١٩٤) عَنْ عَائِـشَةَ رضي الله عنها قَالَـتْ: سَـابقَنِي رَسُـولُ اللهِ ﷺ فَـسَبَقْتُهُ، فَلَبِثَتُ حَتَّى أَرْهِقَنِي اللَّحْمَ (أَيُ سَمِنْتُ) سَـابَقَنِي فَـسَبَقَنِي، فَقَالَ: ((هٰذِهِ بِتِلْكَ(أَيْ وَاحِدَةً بِوَاحِدَةٍ).)) صحيح جامع الصغير.

**واته**: پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێی لەگەڵ کردم من پێشم دایـەوە، پـاش ماوەیەکی تر گۆشتم گرت و (واتە قەڵەو بووم) پێشبڕکێی لەگـەڵ کردم، ئەجارەیان پێشی دامەوە، فـەرمووی: بـەوی تریـان (واتـە یەك بەیەك).

١٩٥) عَنْ أُمَ عَطِيَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: ((أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُـولُ اللهِ ﷺ عِنْدَ الْبَيْعَةِ أَنْ لاَ نَنوُحَ، فَمَا وَفَتْ مِنّاً اِمْرَأَةٌ غَيْرَ خَمْـسِ نِـسْوَةِ: أم سـليم وأم عـلاء وابنـة أبـي سـبرة امـرأة معـاذ وامرأتان أو ابنة أبي سبرة وامرأة معاذ وامـرأة أخـرى. قـد كان رسول الله ﷺ يتعاهد النساء لهذه البيعة يوم العيد)) رواه البخاري.

**واته**: پێغەمبەر ﷺ کردی بە مەرج بەسەرمانەوە لەکاتی پەیمانەکەدا کە شین و خۆڕنین و لەخۆدان نەکەین، کەس لەئێمە وەفای نـەکرد بە پەیمانەکەیەوە، جگە لـە پێـنج ئـافرەت: کـە دایکـی سـلیم و دایکی عەلا و کچی ئەبی سبرە و خێزانـی مـەعاز و ئـافرەتێکی تـر، پێغەمبـەر ﷺ ئـەم پەیمانـەی لـە ڕۆژی جـەژن لەگـەڵ ئافرەتەکاندا دەبەستەوە.

---

١٩٦) قـال رسـول اللهﷺ: ((..اِستَوْصَـوا بِالنِّسَاءِ خَيْـراً)) رواه البخاري ومسلم.

**واتە**: ڕێنمایتان دەكەم بە چاكەكردن لەگەڵ ئافرەتان.

١٩٧) قـال رسـول اللهﷺ: ((الْعِلْـمُ فَرِيـضَةٌ عَلَـى كُـلِّ مُـسْلِمٍ وَمُسْلِمَةٍ)) رواه ابن ماجه والطبراني في الأوسط والصغير.

**واتە**: داواكردنی زانست پێویـستە لەسـەر هـەموو ئافرەتـان و پیـاوانی موسڵمان.

١٩٨) عَنْ عَائِشَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا قَالَـتْ: كَـانَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ يَغْسِلُ ثَوْبَهُ وَيَحْلِبُ شَاتَهُ وَيَخْدِمُ نَفْسَهُ)) رواه البخاري.

**واتە**: پێغەمبەرﷺ جل و بەرگی شۆردووە، شیری دۆشیوە، خزمەتی خۆی و خێزانەكانی كردووە.

١٩٩) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ قَوْماً قَـالُوا: يَـا رَسُـولَ اللهِ! إِنَّ قَوْماً يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ لاَ نَدْرِي أذكـر اسـمَ اللهِ عَلَيْـهِ أَمْ لاَ؟ فَقَالَ: ((سموا عَلَيْهِ أَنْـتُمْ وَكلـوا)) قالـت: (وَكَـانُوا حَـدِيثِي عهد بالكفر)) رواه البخاري وغيره.

**واتە**: لە خاتوو عـائیشەوە دەگێڕنەوە، كەوا قـەومێك گوتیـان: ئـەی پێغەمبەری خواﷺ! قەومی وا هەیـە كـە گۆشـتمان بـۆ دێـنن، ئێمە نازانین ئایا ناوی خوایان لێ هێناوە یان نـا؟ پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ئێوە ناوی خوای لێ بهێنن و بیخۆن.. خاتوو عـائیـشە

فەرمووی: ئەوانە تازە لە کوفر گەڕابوونەوە.

٢٠٠) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَّهَا أَمَّت النِّسَاءَ فِي صَلاَةِ الْمَغْرِبِ، فَقَامَتْ وَسَطَهُنَّ وَجَهَرَتْ بِالْقِرآءةِ)) انظر مفصل أحكام المرأة ج١ ص٢٥٤.

**واته:** حەزرەتی عائیشە ڕەزای خودای لەسەر بێت، ئیمامەتی بۆ ئافرەتان کردووە لە نوێژی خۆرئاوابوندا(المغرب) وە لەناوەڕاستیان وەستاو بە دەنگی ئاشکرا قورئانی لەناو نوێژدا خوێند.

له کۆتاییدا لەخودای پەروەردگار دەپاڕێمەوە کـە ئـەم بەرهەمـەم لێ وەربگرێت، بیکاتە توێشوی ڕۆژی دوایی، وە داوا لە خوێنـەرانی ئـەم نامیلکەیە دەکەم، کە ئەگەر هەر کەم و کوڕی و ناتەواویەکیان کەوتە بەرچاو، بەچاوی لێبوردن و چاوپۆشییەوە بۆی بـڕوانن و هەڵـەکانم بـۆ ڕاست بکەنەوە ئەگەر هەبوون.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

**دهۆك – بەڕۆشکێ**

**٢٠٠١/٣/١٢**



٢٠٠
فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ
بۆ ئافرەتان

پێغەمبەرمان درودی خوای گەورەی لەسەر بێت هیچ لایەنێکی ژیانی مرۆڤی بەپەراوێز نەکردووە. لێرەدا یەکێک لە گەورەترین ئەو هۆیانەی کە دوژمنانی ئیسلامی پەنای بۆ دەبەن بۆ دژایەتی پێ کردنی موسڵمانان بێگومان ئافرەتە. بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست زۆر چاک لەهەموو ئەو وەڵامانەی داتەوە کە دوژمنان ئەمڕۆ لەخەڵکانێک دەکەن ئازادییەک بێ ئاگان لەو گرینگیپێدانەی پێغەمبەر بەرامبەر بەئافرەت...

کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
دیزاین چاپکردن بڵاوکردنەوە
hawler.chap@gmail.com
عێراق - کوردستان - هەولێر

نرخ ٢٠٠٠ دینار